ئەندەرسن

# بەرازەوان

وەرگێڕانی: عەزیز گەردی

بەڕێوەبەرێتیی گشتیی خوێندنی کوردی چاپی کراوە

# پێشەکی

مندالینە ، ڕۆژتان شاد •

وەرن دانیشن هەندێ هەقایەتی خۆشتان بۆ بگێڕمەوە • زووکەن وەرن • ئەوەی درەنگ بێ پێکی ناکەین •

وای هەقایەتەکان خۆشن ! پێشتر نەمیستبونو نەمدەزانین • ئەو ساڵ زستانێ دونیا تەڕو تووش بوو • باو باران بوو • ڕێبوارێکی بێگانە هاتو لای‌دایە ماڵمان • منیش بەخێرهاتنێکی گەرمم کرد • کە زانیم هەقایەتان دەزانێ چەند شەوێك ئێزنم نەدا ، بڕوا • داوام لێ‌کرد هەندێ هەقایەتم بۆ بگێڕێتەود • ئەویش تکای گرتمو قسەی نەشکاندم • دەستی پێ‌کرد بە ڕوویەکی خۆش‌و بە دەنگێکی نەرم‌و ناسك چی هەقایەتی دەزانی بۆی گێڕامەوە •

پێش ئەوەی بڕوا پێی‌گوتم گەردەنت ئازا نەبێ ئەگەر ئەم هەقایەتانە بۆ منداڵان نەگێڕیتەوە • منیش بەناوی خۆم‌و بە ناوی ئێودوە سوپاسم کردو گفتیشم پێدا هەقایەتەکانی بۆ ئێوە بکەمە دیاری • بەتایبەتی لە ساڵێکی وەکو ئەم ساڵ کە ساڵی ئێوەیە • ئێوەش هەقێ خۆتانە

لەم ساڵە تافانەیەدا داوای هەموو مافێکی خۆتان بکەن • ئاخ ! چ بکەم مافی ئێوە لە دەستەمن نی‌یە • ئەگەر لە دەستەمن با بڕوا بکەن وەکو چوکلاتی شیرین دەمخستە نێو زاری بچکۆڵەتانەوە •

منداڵینە !

ئەز هەر هەندەم لە دەست دێ بە بۆنەی ئەم ساڵە پیرۆزەوە هەندێ هەقایەتی خەڵکتان بە زمانی خۆمـان بـۆ بگێڕمەوە خەمی سەر دڵـی بچکۆلەتان نەختێ بڕەوێنمـەوە ئەگەرچی دەزانـم خەمی ئێوە لە خەمی ردێن‌سپی وولاتان زیاترەو بە هەقایەتۆکەی بێگانان ناڕەوێتەوە بەڵام چ بکەم لەو هەقایەتانە زیاتر هیچ دیاری شك نابەم کە ئێوە نـەبێ هەموو منداڵانی دونیا بە زمانی خۆیان بۆیان گەڕاوەتەوەو تامیان لێ‌وەرگرتووە•• جا کە من ئەو هەقایەتانەم گوێ لێ‌بوو چاوم بەرایی نەدا ئێوە لێ‌بێ‌بەش بکەم • لەبەر ئەوەش کە نەمویست ئەو زەحمەتە بدەمە بەر ئێوەو بانگتان بکەمە لای خۆم ، بڕیارم دا خۆم بێمە ماڵتان‌و هەندێ هەقایەتی خۆشی مامە ( هانز )تان بۆ بگێڕمەوە •

ئەرێ دەزانن ئەو مامە هانزە کێ‌یـە ؟ خەڵـکی کوێندەرە ؟ ئـەم هەقایەتانە لە کوێ فێر بووە ؟

ئەگەر نازانن ، گوێ‌ڕاگرن با پێتان بڵێم :

کوڕینە ، ئەو مام هانزە وەختی خۆی منداڵێکی زۆر زیرەك‌و ئازاو خاوێنی وەکو ئێوە وا بـوو • لە ئێوەش بچـووکتر بوو •• وەکو بـرا بچووکەکەتان وا بوو •

سەدو حەفتاو چوار ساڵ پێش ئێستا لە مانگی نیسان هاتە دونیاوە • مانگی گوڵ‌و کولوولك‌و حاجیلەو شەوبۆ •• مانگی نیسان ئەوەندە خوش‌و

بۆندار بوو هانز ویستی یەکەم رۆژ بێتە دونیاوە ، بەڵام تەماشای گرد خەڵکەکە لەو رۆژەدا درۆو فیشاڵیان دەکرد . گاڵتەیان بە یەك دەکرد ئەویش رکی لەو جۆرە درۆیانە دەبووەوە بۆیە یەکەم رۆژ نەهاتە دونیاوە، رۆژی دووەم هاتە دونیاوە . ئەو رۆژی کە ئەو هات منو تۆ هێشتا لە پشتی باپیرە گەورەماندا بووین .

ئەویش وەکو ئێمە نازداری داكو بابی خۆی بوو . قەت لە قسەیان دەرنەدەچوو . ئەو کاتە بابی بیستو پێنج ساڵان بوو . دایکی لەخۆ گەڕابووەوە . تەمەنی چل ساڵ بوو .

ئەو داكو بابە هانزیان زۆر خۆشدەویست . شەوو ڕۆژ ئیشیان دەکردو دەیانکردە پارووپەكو دەیانهاویشتە زاری هانز .

بابی پینەدۆز بوو . پینەدۆزێکی قسەخۆشو روحسووك بوو . پێڵاوی منداڵی گەڕەکی خۆیانی بە هەرزان چا دەکردەوە . چونکە دڵی نەدەهات بە پێخواسی بگەڕێنو پێیان لەسەرمان سڕ بێو لەناو قوڕو چڵپاودا چڵکن بێ .

باوکی هانزیش وەکو پینەدۆزەکەی دراوسێتان بە هەموو دەمێ لە دوکانێ بوو . هەقایەتی زۆر خۆشی دەزانی . کە هانزی کوڕی فەرازی بوو هەموو یەکشەموان دەیبردە سەیرانێو هەموو جارێ هەقایەتی بۆ دەگێڕایەوە .

هەموو هەقایەتەکانی لافۆنتێنو شەکسپیرو هەزارو یەك شەوەی بۆ گێڕایەوە .

بەڵام سەد حەیفو مخابن بۆ هانزی بچکۆلانە . هێشتا هەر منداڵ بوو . یازدە ساڵان بوو . کە ئەو باوکە خۆشەویستەی مرد . ئیدی هانز

هەتیو کەوت‌و کەس نەبوو هەڤایەتی بۆ بگێڕێتەوە • ها ، ئەوەم لە بیر نەبوو • دایکیشی کە بە کارەکەری‌و بێوەژن‌کۆنی بەخێوی دەکرد ، هەر کاتێ دەرفەتی بوایە • بە تایبەتی زستانان لەبەر ئاگردانی دادەنیشت‌و چیلکەی لە ئاگر وەردەداو هەڤایەتی پەری‌و حۆری‌و قاز‌و قورینگ‌و کوڕەپاشاو دێو‌و درنج‌و ئەجندەو فریشتەی بۆ دەگێڕایەوە •

هانز بچکۆلە منداڵێکی روح‌سووک‌و خوێن شیرین‌و قسەقوت‌و دەم بە پێکەنین بوو • زۆری حەز لە نوکتەو گاڵتەو پێکەنین بوو •

کاتێ کە تەمەنی بوو بە چواردە ساڵی ، دوورگەی ( فین )ی لێ‌وەتەنگ هات • بێچووە چۆلەکە باڵی بێ هێلانەی دایکی لێ‌وەتەنگ دێ • هانز زانی دونیا لەو دوورگەیە گەورەترە • شارو وولاتی‌تر لەو دیو دەریاوە هەن • بۆیە سەری هەڵگرت‌و رۆیشت • ئەوەندەی دایک‌و داپیری بەبەری داکەوتن ، مردن‌و سووتان ، نەگەڕاوە • چووە کۆپنهاگن • بەینەك لەوێ مایەوە پاشان کەوتە گەڕان‌و سەراپای دانیمارك گەڕا • دڵی بەوەندەش دانەکەوت سەری لە ئەڵمانیاو فەڕەنساو ئیتالیاو سویسرا دا • زۆر شارو ئاوەدانی دیت •

هانز رەوشتێکی هەبوو • بچووبایە هەر شوێنێك هەڤایەتی خۆی بۆ خەڵك دەگێڕایەوەو گوێی لە هەڤایەتی خەڵك رادەگرت • تا وای لێ‌هات هەزاران هەڤایەت فێر بوو •

هانز کوڕێکی بێ‌فیز بوو • برادەری منداڵان بوو • منداڵی زۆر خۆش‌دەویستن • بگەیشتبایە هەر جێگایەك دەچووە ناو منداڵان • منداڵی دەدا دوو خۆی • لەناویان دادەنیشت‌و زۆر بە شیرینی هەڤایەتی بۆ دەگێڕانەوە •• هەر منداڵێك هەڤایەتی بێ‌بڕیبایە دووشکی لەگەڵ دەکردو قەت لەگەڵی پێك نەدەهاتەوە •

وأی ، ئێستا بمابایە چەند خۆش بوو من و ئێوەش بچووبایین ، گوێمان بدابایە هەقایەتەکانی . بەڵام کوا ؟

منداڵینە :

وا تێ نەگەن هانز ی هاوڕێمان تەنیا هەقایەتی دەزانی . نا ، نا . هانز زۆر زیرەك بوو .. شیعری دادەنا . شیعری خۆش . کتێبێکی نووسیوە پڕی شیعرە . جارجارە تەمسیلیەشی دادەنا .. بەین بەینە رۆمانیشی دەنووسی . ئەدی زیرەکی ئاوها دەبێت !!

منداڵینە !

دەزانن هانز ئەو هەموو هەقایەتە خۆشانەی لە کوێ هێنا بوو ؟

هەندێ هەقایەتی لە داك و باب و خزم و کەس و کارو میللەتەکەی بیست بوون . چۆنی بیست بوون بە دەقە خۆی دەیگێڕانەوە . کوڕێکی دەستپاك بوو هەقایەتەکانی نەدەگۆڕی .

هەندێکی لەناو کتێبان دەرهێنابوون . لە نووسەرانی پێش خۆی وەگرتبوون . تیف تیفەی دابوون . بە شێوەی خۆی بۆ منداڵانی دەگێڕانەوە .

هەندێ هەقایەتی وایشی دەزانی ، کە لە کەس فێر نەبووبوو ، نە کەسی نەبیست بوون خۆی دای نابوون . لە سنگی خۆی دەری هێنابوون .

جا هانز ئەوەندە گەڕا ، ئەوەندە خدووی دا هەقایەتان ، ئەوەندە منداڵی لاواندنەوە تا پیر بوو . کە پیر بوو منداڵ ناویان نا مام هانز . مام هانزیان زۆر خۆش دەویست ، هەموو جارێ قۆڵ قۆڵ دەچوون دەیانگوت مام هانز هاتووین گوێزت دەدەینێ ، باقلاوەت دەدەینێ ، ڕۆژانەی خۆمانت

دەدەینێ هەر هەندە هەقایەتێکمان بۆ بگێڕەوە • ئەویش یەکەو ماچی گەرمی لە تەختی تەوێل دەکردن‌و دەستی بە سەری دادەهێنان‌و لەکن خۆی دادەنان‌و هەقایەتی بۆ دەکردن •

مام هانز ئەوەندی هەقایەت کردبوو ، بەم دواییە وای لێ‌هاتبوو دونیای هەموو لەلا ببووە هەقایەت • تەماشای هەر شتێکی بکردایە هەقایەتێکی لەسەر دادەنا •

مندالێنە :

مام هانز هەندی هەقایەت بۆ مندالی وەکو ئێوە گێڕایەوە ، هەندی گێڕایەوە ، تا بوو بە مام هانزی هەقایەتبێژ • هەقایەتەکان ئەوەندە خۆش بوون شارەو شار خەڵك لە وولاتی بێگانان کۆمەڵ کۆمەڵ دەهاتن ئەو هەقایەتانەیان دەبردو لە ماڵەوە بە زمانی خۆیان بۆ مندالانیان دەگێڕانەوە، تا مام هانزو هەقایەتەکانی دونیایان پڕ کرد • کەس نەما مام هانز نەناسیو هەقایەتەکانی لەبەر نەبێ • تەنیا من‌و ئێوەو چەند مندالێکی بێ‌کەسی وەکو ئێمە نەبێ ، کەسمان نەبوو لە تەنیشت خۆیمان دابنێ‌و ئەو هەقایەتانەمان بۆ بکات • مام هانزیش لە تەمەنی پەنجا سالی‌دا عەمری خوای کرد •

هەر چەندە مام مانز مندالانی جیهانی بەجێ‌هێشت بەلام(١٥٦)هەقایەتی زۆر خۆشی بۆ بەجێ‌هێشتن تا هەموو جارێ بیانخوێننەوەو رەحمەت بۆ گیانی پاکی بنێرن •

(١٥٦) هەقایەت زۆر زۆرە • ناتوانم بە جارێك هەمووتان بۆ بگێڕمەوە • بۆیە ئەمشەو بەبۆنەی سالی خۆتانەوە هەندێکتان بۆ دەگێڕمەوەو گفتیشتان دەدەمێ هەر کاتێك دەرفەتم بوو کۆمەڵ کۆمەڵ ئەوانەی‌تریشتان پێشکەش بکەم •

بێگومان مام هانز بزانێ چیرۆکەکانی کەوتوونەتە ناو منداڵە کوردانیش زۆری هەوەس پێ دێت • چونکە مرد وەسیەتی کرد چیرۆکەکانی پێشکەش هەموو منداڵانی دونیا بکرێن •

دەك گۆڕت پڕ نوور بێ مام هانز بۆ خۆت و بەرەکەتت ! دە ئێوەش بڵێن • ئامین ! • •

ـ ئـامین ! ـ

عەزیز گەردی

براتسان
هەولێر ـ ١٩٧٩/٣/٩

# چـەرخ

ڕۆژێك لە ڕۆژان سەربازێك لە شەڕ دەهاتەوە. خورجینەیەکی بە شانی دادا بـوو . خەنجەرێـکی لەبەر پشتێنی ڕاکردبوو . دەهات و پێی لە زەوی دەکوتا ، قۆلی بادەدا : چـەپ ، ڕاسـت . چـەپ ، ڕاست. لە ڕێگادا تووشی پیرەژنێکی عەییار هـات. پیرەژنەکە زۆر پیس و ناشیرین بوو . لچی تا سەر سنگی هـاتبووە خـوارێ . مـاندووبوونی لـە سەربازەکە کردو پێی گـوت : « بـەخوا پیاوێـکی بەجەوهەری . خەنجەرەکەت خەنجـەری پیـاوانە . خورجینەکەت گەورەو بەنرخە . ئەگەر سەربـازی راستی لەدونیادا هەبێ ئەوە تۆیت . قسەیەکم هەیە پێت دەڵێم ، ئەگەر بەگوێم بکەی چەندت پارە بـوێ بۆت دەبێ . »

سەربازەکە گوتی : « داپیرە ! مەمنوونم ! »

پیرەژن دەستی بۆ درەختێك درێژ کرد ، گوتی :

« ئەو درەختە دەبینی • ئەوە ناوەگەی کلۆرە • بڕۆ سەرێ دەبینی کونێکی تێدایە • تۆی پێوە دەچێت • بەو کونەدا بڕۆ خوارێ • منیش پەتێکت لەناو قەدی دەبەستم • هەرکاتێک بانگت کرد هەڵتدەکێشمەوە . »

سەربازەکە گوتی : « باشە ، کە بەناو درەختەکەدا چوومە خوارێ ، لەوێ چ بکەم ؟ »

پیرەژن گوتی : « پارەی تێدایە • بۆ خۆت بینە • کە گەیشتیتە بنی درەختەکە خۆت لە چەقی ڕێگایەکی بەریندا دەدۆزیتەوە • زۆر ڕوناکە • سەد چرای زیاتر تێدا دەسووتێ • سێ دەرگای لێیە . کلیلیان لەسەرە • بیانکەوە . بڕۆ ژووری یەکەم • دەبینی سندووقێکی گەورە لە ناوەندی ژوورێیە ، سەگێکی لەسەر وەرکەوتووە ، هەر چاوێکی هێندەی ( ژێر ) پیاڵەیەکە .. مەشێوێ • ئەم چارۆگەی خۆمت دەدەمێ • کە چووی لە ژوورێ ڕای بخە • بەبێ ترس لە سەگەکە بڕۆ پێش • هەڵیبگرەو لەسەر چارۆگەی منی دابنێ • سندووقەکە بکەوە . دەبینی پڕ پارەیە • تووجی تێدایە • چەندی حەز دەکەیت ئەو تووجە بۆ خۆت بێنە • ئەگەر زیویشت دەوێ بڕۆ ژووری دووەم• ئەو سەگەی لەوێ لەسەر سندووقەکە وەرکەوتووە هەر چاوێکی تەمەت بەرداشێکە • هیچ خۆت لە گوورە مەبە . سەگەکە

بگرەو بیخە سەر چارۆگەی منو چەند زیـوت دەوێ بۆ خۆت لەناو سندووقەکە دەری بێنــە .. ئـەگەر زێڕیشت دەوێ . تا پێت هەڵدەگیرێ زێـڕت لـە زووری سێیەم دەست دەکەوێ . بەڵام ئەو سەگەی لەوێ لەسەر سندووقی پـارە وەرکەوتـووە هـەر چاوێکی بەقەد بورجەکەی کۆپنهاگن دەبێ . لە منی وەربگرە، سەگێکی بەڕاستی‌یە . بەڵام نەکەی خۆت تێك بدەی . هەر ئەوەندە لەســەر چـارۆگەی منی دابنێ هیچ ئەزیەتت نادات . جا تێ‌بکەوە تا حـەز دەکەی زێڕی ناو سندووقەکە بۆ خۆت بێنە . »

سەربازەکە گوتی : « خراپ نی‌یە . بەڵام پیرەژن، ئەدی ئەتۆ چیت لەمن دەوێ . چت بدەمێ ؟ هەڵبەت شتێکت دەوێ . »

پیرەژن گوتی : «دەسەرت سووڕێم ، فلووسەکم لە تۆ ناوێ . یەك ئیشی بچووکم هەیە بۆم بکە . وەختی خۆی کە داپیرم لەو وولاتە هاتەوە ، چەرخێکی کۆنی هەبوو . لەوێی لەبیر کردبوو . هەروا لەوێ‌یە . ئەو چەرخە بۆ داپیری خۆت بێنــەوە چیدیــم لەتـۆ ناوێ . »

سەربازەکە گوتی : « زۆر باشە . پەتەکەت بێنە با لە ناوقەدم ببەستم . »

پیـرەژن گوتـی : « فـەرموو . ئــەوەش چارۆگەکەم . »

سەربازەکە چووە سەر درەختەکەو لەوێوە بەناو کونەکەدا شۆڕ بووەوە خوارێ • پیرەژنی عەییار چۆنی باس کردبوو کتو مت ئەوها دەرچوو • لەبنەوە ڕێگایەکی بەرین‌و فراوان بوو • سەد چرا دەدرەوشایەوە . دەرگای یەکەمی کردەوە . پەککو چنۆ سەگی تێدا بوو ! هەر چاوێکی هێندەی (ژێر) پیالەیەك بوو. سەگەکە لێی‌مۆڕ بوەوە. سەربازەکە بە نەرمی دواندی : «سەگەکە . سەگی جوان . کوڕی باش . » • چارۆگەی پیرەژنەکەی ڕاخست‌و سەگەکەی هەلگرت‌و لەسەری دانا • سندووقەکەی کردەوە . گیرفانەکانی خۆی پڕ تووج‌کرد • سندووقەکەی پێوەداوەو سەگەکەی وەکو جاران دانایەوە سەری‌و ڕۆیشت • چووە ژووری دووەم . پەککو ئەمە سەگە ، ئەدی !! هەر چاوێکی بەقەد بەرداشێك بوو • سەربازەکە پێی‌گوت : « سەگەکە وا زەق تەماشام مەکە ، بۆچاوت خراپە • چاوت شل دەبێت • »

سەگەکەی بلندکردو لەسەر چارۆگەی پیرەژنی دانا • سندووقەکەی کردەوە . کە چاوی بە زیوەکە کەوت • ئەو تووجەی هێنابووی هەمووی فڕێدا . خورجینەو گیرفانەکانی لە زیو هەلاخنی • سندووقەکەی داخستەوەو سەگەکەی دانایەوە جێگای خۆی •

پاشان چـووه ژووری سێیــەم ٠ وەی ، وەی ، وەی !! لەو سەگە ترسناکە !! دووچاوی پێوه بوو، هەر چاوێکی بەقەد بورجێکی خڕ بوو ، وەکو خولخولە لە کەللەی سەریدا دەخولایەوه ٠ سەربازەکە سەری بۆ دانەواندو گوتی : « ئێوارەت باش ٠ » هیچ سەگی وای نەدی بوو ٠ نەختێ ووردی لیٚ کرد . پاشان تانی لە خۆیداو لیٚیچووه پێش . هەلی گرتو لەســەر چارۆگەی پیرەژنی داناو سندووقــەکەی کردەوه ٠ خەنی سەد خەنی . وای ، چەندی زێڕ تێدا بوو ! ئەو هەموو زێــڕەی هــەبێ هــەموو ( کۆپنهــاگن )ی پیٚدەکڕێ ٠ هەرچی گلّمته شــەکرو (سەربــازه ـ قووتوو )و قەمچیو ئەسپی لەرزان هەیه هــەمووی پیٚدەکڕێ . . کە سەربازەکە ئەمەی دی ، ئەو زیوەی لە خورجینەو گیرفانەکانیدا بوو هەمووی فڕیٚدا . کەوته بــەریٚ هــەموو گیرفانــەکانو خورجینــەو سیدارەو پۆستاڵەکانی شیشکوت کرد لە زێڕ ٠ بە حەستــەم پــیٚیدەکرا لەبــەر بجوولێتــەوه ٠ سندووقەکەی توند داخستو ســەگەکەی لەســەر دانایەوه ٠

کە تێری زێڕ هێنا ، هاتەوه لای کونەکەو بانگی سەرەوەی کرد : « پیرەژن ، هەلّمبکێشەوه ٠ »

پیرەژنی عەییار گوتی : « چەرخەکەت هێنا ؟»

سەربازەکە گوتی : « تواهوو ! هەر لەبیریشم

نەبوو • چا بوو بە بیرت هێنامەوە . »

خێرا چوو چەرخەکەی هێناو پیرەژن هەڵی کێشایەوە •

سەربازەکە هاتەوە سەر دونیاو گیرفانەکانو خورجینەو سێدارەو پۆستالەکانیشی لە زێڕ هەڵاخنی بوو • بە پیرەژنی گوت : « پیرەژن ، ئەوا چەرخەکەم هێناوهاتمەوە . بەڵام دەبێ پێم بڵێی چ ئیشت بەم چەرخەیە ؟ »

پیرەژن گوتی : « تۆ هەقت بەسەر شتی وا دا نەبێ ، باش نی‌یە • پارەی خۆت وەرگرت . چ هەقت لەسەر من نەما . بێنە چەرخەکەم بدێ • »

سەربازەکە گوتی : « قسەی وا پارەو پوول ناکات • ئەگەر بەڕاستی پێم دەڵێی چ ئیشت بەم چەرخەیە ، باشە. دەنا بەم خەنجەرە سەرت دەبڕم. »

پیرەژن گوتی : « سبەریشم ببڕی پێت ناڵێم • »

سەربازەکە تووڕە بوو • سەری پیرەژنی بڕی. کەلەشی پیرەژنێ کەوتە ئەو گۆڕە • ئەویش چەرخەکەی خستە باخەڵی‌و هەموو پارەکەی لە چارۆگەی پیرەژنەکە کردو هەر چوار چمکی هێنایەوە یەكو گرێی‌داو بە پشتی خۆی داداو بەرەو شار کەوتە ڕێ • ئەو شارە شارێکی زۆر خۆش بوو . سەربازەکەش چووە ئوتێلێکی نایابو باشترین

ژووری بەکرێ گرت . داوای خۆشترین خواردنی کرد . چی زۆرە پارەی زۆرە . شاگردبۆیاخچی‌یەك هات . پێڵاوەکەی برد . بۆی بۆیاغ کرد . بەڵام زۆری پێ‌سەیر بوو کابرایەکی وا دەولەمەندو خاوەز زێڕ ئەو پێڵاوە کۆنەی لەپێدابێ . سەربازەکە هێشتا پێڵاوی نوێی نەکڕی بوو . هەر پێڵاوە کۆنەکەی جارانی لەپێدا بوو . بۆ رۆژی پاشترێ جوتە پێڵاوێك‌و دەستە بەرگێکی نوێی کڕی .

سەربازەکە بوو بە پیاوێکی ماقووڵ‌و لەو شارەدا ناوی دەرکرد . پارەی هەیە ! خەڵکی لە دەورەدا کۆبووەوە . برادەری زۆر بوو . برادەرەکانی باسی هەموو شتێکی ئەو شارەیان بۆ کرد . باسی پاشایان بۆ کرد . ئەو باسەشیان بۆ کرد کە پاشا کچێکی زۆر نازك‌و نازداری هەیە .

سەربازەکە گوتی : « پیاو چۆن دەتوانێ ئەو کچە ببینێت ؟ » .

گوتیان : « دیتنی چی ؟ کەس چاوی پێ ناکەوێ . فاڵچی پێشبینی‌یان کردووە گۆیا ئەو کچە مێرد بە سەربازێکی زۆر ئاسایی دەکات . پاشاش ئەمەی پێ‌شوورەیی‌یە . بۆیە کچەی خستۆتە ناو کۆشکێکی گەورەی پۆڵابەند . هەر چواردەوری شوورەی بەرزو قوللەی قیتە . لە پاشا بترازێ کەس نی‌یە هات‌و چۆی بکات .

سەربازەکە لە دلّی خۆیدا گوتی : «وای ، چەند خۆشە ، پیاو چاوی بەو کچە نازدارە بکەوێت ! ! »

ئەو سەربازە زۆر بەشادیو بەختیاری رایدەبوارد · نەیدەزانی خەم چییە ؟ گەمەی دەکرد. سوارسوارانێی دەکرد · پارەی بەبەر هەژاران وەر دەکرد . وەختی خۆی نەبوونیشی دیبوو · بەخوا ناخۆشە پیاو یەك فلسی نەبێت · بەلاّم ئێستا دەولەمەند بوو ، پۆشتەو پەرداخ بوو . برادەری زۆر بوو . هەموو خۆیان بە دۆستی دلسۆزو ئەویان بە پیاوێکی ماقوول دادەنا · سەربازەکە زۆر لە خۆشی دابوو بەلاّم لەبەر ئەوەی بە پای پیلان پارەی خەرج دەکردو یەك فلسی دەسکەوت نەبوو ، زۆری پێنەچوو پەڕپووت بوو . لە دوو درهەم زیاتری نەما · ناچار بوو لە ژوورە خۆشەکە باری کرد · چووە کۆلیتێکی تەنگو تار · بە تاقی تەنێ مایەوە · هەموو برادەرەکان لێی دوورکەوتنەوە · وای لێهات خۆی پێلاّوی خۆی بۆیاغ دەکردو کە بدڕابا پینەی دەکرد·

ئێوارەیەکیان کە دونیا تاریك داهات ، لەبەر تاریکی دانیشت نەی بوو تەنانەت یەك موم بۆ خۆی بکڕێ · نازانم چۆن بوو ، کتوپڕ چەرخەکەی هاتەوە بیر · ئەو چەرخەی کاتی خۆی بە قسەی پیرەژنی عەییار لە ناو درەختە کلۆرەکەدا هێنابوویە دەرێ ·

چەرخێکی لێدا ، کە پرووشــك لــە بــەردەکە چەخماخەی دا یەکسەر دەرگا کرایەوە • ئەو سەگەی لەبەردەم پەیدا بوو کە هەر چاوێکی بەقــەد (ژێــر پیاڵەیەك بوو • سەگەکە گوتی : گەورەم ، ئەمر کە. لە خزمەت دام . »

سەربازەکە لە دڵی خۆیدا گوتی :«ئەی عاجباتی. هەبێو نەبێ ئەم چەرخە شتێکی وایە هەرچی بمەوێ بۆم جێبەجێ دەکات • » جا بە ســەگەکەی گــوت : « قەلۆشم • هیچم نییە . هەندێك پارەم دەوێ . »

سەگەکە وەك بروسکە دەرپەڕی ، بە چاونوقانێك هاتەوە • کیسەیەکی پڕ تووجی بەدەمــەوە بوو . هێنای لەبەردەمی دانا •

ئیدی سەربــازەکە زانــی ئــەو چەرخە چەنــد بەسوودەو چۆن بە هانایەوە دێت • ئەگەر یەك جاری لێبدایە ئەو سەگە دەهات کــە لەسەر ســندووقە تووجەکە وەرکەوتبوو • ئەگەر دوو جاری لێبدایە ئەوەی پاسەوانی زیو بوو ئەو دەهات • ئەگەر سێ جاری لێبدایە ئەوەی خاوەن زێڕەکە دەهات •

سەربازەکە بووەوە پارەدار • گەڕایەوە ژوورە خۆشەکەی جارانی • بەرگی پۆشتەی کردەوە بەر . برادەرەکانی ناسیانەوە • لە دەوری کۆبوونــەوەو پەرۆشی خۆیان بۆ باس کرد •

شەوێکیان سەربازەکە کەوتە خەیاڵاتو لێکدانەوە · « وای سەیرە ! تۆ وەرە نەتوانی چاوت بە کچی پاشا بکەوێ · وای دەڵێن جوانە . بەڵام کە ساڵ دوازدەی مانگ لە کۆشکی پۆلابەندا دەرگەی لەسەر کلیل درابێتو بە شوورەو فوولەی سەخت تەنرا بێ کێ دەستی دەگاتێ ؟ . ئاخۆ دەبێ ئەمن بە دیداری ئەو نازدارە شاد ببم ؟ ، ئەها !! دۆزیمەوە.. دۆزیمەوە . . کوا چەرخەکەم ؟ »

چەرخێکی لێدا · ئەو سەگەی هەر چاوێکی بەقەد (ژێر) پیالەیەك بوو وەك بروسکە هاتو لە پێشی حازر بوو . .

سەربازەکە پێی گوت : « ئەگەرچی نیوەشەوە ، بەڵام زۆرم مەراقە ، ئەگەر بۆ چاوتروکانێکیش بێ ، چاوم بە کچی پاشا بکەوێ · »

سەگەکە یەك رکێب بۆی دەرچوو · سەربازەکە هەر هێندەی ئاگا لێبوو سەگەکە هاتەوەو کچی پاشای لەسەر پشت بوو · کچەکە هەر لە خەوی شیریندا بوو . بەڵام ئەوەندە جوان بوو هەر کەسێ چاوی پێبکەوتایە دەیزانی ئەوە کچە پاشایە ·

سەربازەکە ، کە سەربازی راستی بوو ، خۆی پێنەگیرا · ماچێکی لێکرد . ئنجا سەگەکە تێی تەقاندو کچەپاشای بردەوە ·

بۆ بەیانی کە پاشاو شاژن لەسەر چا خواردنەوە بوون . کچە چووە خزمەتیان بۆی گێڕانەوە کە شەوێ دی خەونێکی سەیری بە سەگێك‌و سەربازێـکەوە دیوە . سـەگەکە لە پشـتی خـۆی کردووەو بـۆ سەربازەکەی بردووە. سەربازەکەش ماچی کردووە.

شاژن گوتی : « مەندێ ئەو ئەزیرۆکانەیە . »

کارەکەرێکیان ڕاسپارد شەوی داهاتوو نۆبەت لە جێ‌و بالینگانی کچە بگرێ . بزانێ داخـۆ ئەوەی ئەو دەیلێ ڕاستە یان خەونە .

شەوی دووەم سەربازەکە دیسـان ئـارەزووی دیداری کچەی هەستا ، چەرخێکی لێ‌دا . سەگەکـە هات . چوو کچەی هێناو هاتەوە . کە لە کچەکە ڕوو هات کارەکەری نۆبەتدار خێرا جل‌و بـەرگی کردە بەرو بە هەڵەداوان کەوتە دووی . کە دیتی چـووە خانوویەکی گەورە ، لە دڵی خۆی‌دا گوتی : « ئۆخەی، ئەوا زانیم بردیە کوێ ؟ » . پـارچە تەباشیرێـکی هێنا . ڕاست‌و چەپێکی لە دەرگاکە داو چووەوە بە دڵنیایی لێی‌نووست . زۆری نەبرد سەگەکە کچەی بردەوە ، بەڵام کە دیتی خانووی سەربازەکە ڕاست‌و چەپی لە دەرگا کراوە . زانی ئەمـە شتێـکە . چوو ئەویش دەستی دا پارچە تەباشیرێك‌و ڕاست‌و چەپی لە هەموو دەرگای خانووەکانی شار دا . زیرەکی ئاوها دەبێ ! کە هەموو دەرگاکان ڕاست‌و چەپیـان

بە سەرەوە بێ هەڵبەت کارەکەرەکە خانووی گۆڕینی ناناسێتەوە .

سپێدە زوو . پاشاو شاژن ، کارەکەرو هەمـوو دەستو پێوەندی بارەگایان بە گەڵ خۆیاندا ، چوون بزانن شازادە براوەتە کوێو بۆ کێ براوە؟ کە پاشا چاوی بە یەکەم دەرگا کەوت ڕاستو چـەپی لێدرا بوو ، هاواری کرد : « ئەوەتا ! »

شاژن دیـتی دەرگـای دووەم ڕاسـتو چـەپی لێدراوە ، قیژاندی : « نەخێر ، پیاوەکە · ئەو نی یە . سەیر کە ئەمەیان خۆیەتی . »

هەموو پێکەوە چاویان بەو هەموو ڕاستو چەپانە کەوت ، هاواریان کرد : « ئەوەتا یەکێـك ، ئەوەتـا یەکێکی تر · یەکێکی تر . » تەماشای هەر دەرگایەکیان کرد ، ڕاستو چـەپی لێدرا بـوو · تێگەیشـتن تـەفرەدراونو ئـەو گەڕانەیـان بێفایدەیـە ، خانووەکەیان پێنادۆزرێتەوە ·

شاژن ژنێکی مـەکرۆ بـوو · بێجـگە لـە گالیسکەهاژوان شتی تریشی دەزانی · مقەسێـکی گەورەی زێڕی هێنا · هـەندێ پـارچە ئـارمووشی هەڵبڕیو تۆربەیەکی گچکەو جوانی دروستکرد · ئەو تۆربەی پڕ دنکە گەنم کردو لـە پشتی کچـەی بەست . بەڵام کونێکی بچووکی لـە بنی تۆربـەکە

هێشتەوە ، بۆ ئەوەی ئەگەر کچەیـان بـرد دنـکە گەنمەکان ڕێوڕێ بڕژێـن‌و بزانـن بردوویانەتـە کوێ ٠

شەو ، سەگەکە دیسان هات. کچە پاشای خستە سەرپشتی خۆی‌و رای کردو بۆ سەربازەکەی برد ٠ سەربازەکە ئەشقی کچە ببوو ٠ لە دڵی خۆیدا دەیگوت ئاخ چۆن کوڕە پـاشا نـەبووم تـا بچمـە داخوازی ئەو کچەو بیهێنم ٠

ئەم جارە سەگەکە ئاگای لەوە نەبوو دنکە گەنمی ناو تۆربەکە هەر لە کۆشکی کچەوە تا بەر پەنجەرەی ئوتێلی سەربازەکە بە ڕیزەڕیز ڕژاوە ٠

بۆ سبەینێ ، پاشاو شاژن شوونیان هەڵگرت‌و زانیان کچە براوەتە کوێ؟ سەربازەکەیان قۆڵبەست کردو دەزندانێ‌یان هاویشت ٠

سەربازەکە بە کزو کوێـری دانیشـت ٠ وای زیندانێکی تاریك‌و نوتەك بوو ٠ چـۆنی بـڵێی وا ناخۆش بوو ٠ ئاگاداریشیـان کردەوە کە بەیـانی لەگەڵ کەوا سپێدێ لەسەری دەدرێ ٠ شتی وا کالتە نی‌یە ! حەیف لەوە دا بوو چەرخەکەی پێ نەبوو ٠ لـە تەنگاویان پێ‌رانەگەیشت بوو بیهێنێ ٠ لـە ئوتێـل بەجێ مابوو ٠

بەیانی لە پەنا شیشەکانی پەنجـەرەی بچـووکی

ژوورەکەوە سەیری کرد خەلکی بە پرتاوی دەچوونە تەماشای لە سێدارەدانی ئەوەوە • دەنگی تەپڵ و کەرەنا دەهات . سەرباز بە جادەدا دەهاتن و تێدەپەڕین • ئەو هەموو عالەمە دەچوونە تەماشایێ.
شاگردبۆیاخچییەکەشیان لەگەلدا بوو بە بەروانکەی چەرمو بە تای جوتە سۆلێك دەچوو • ئەوەندە تەنگاو بوو . ئەوەندە بە هەشتاوی ڕای دەکرد ، لە ڕاکردندا لنگە سۆلێکی پەڕیو کەوتە نزیك پەنجەرەی شیشەبەندی سەربازەکە • سەربازەکە گازی کرد : « هۆ ، شاگردبۆیاخچی • خۆت تەنگاو مەکە . تا من لێرە بم ، هیچ بە هیچ ناکرێ • وەرە درهەمێکت دەدەمێ بڕۆ ئوتێلەکە بۆ شوێنی من . چەرخێکم لەوێ لەبیر کردووە بۆم بێنە • بەڵام خێرا بە . »
شاگردبۆیاخچی بۆ درهەمێك دەچووە ئاسمانێ هەیپەی لێ کرد • چوو . چەرخەکەی هێناو دایە سەربازەکە .
ئەوجا بەزم خۆش بوو • گوێ بگرە بۆت بگێڕمەوە چی قەوما .
قەنارەیەکی گەورەیان لە دەرەوەی شار ، لە گۆڕەپانێك چەقاند • سەرباز دەورەیان کرت . خەڵك لە هەموو لایەکەوە ئاپۆرەیاندا • سەد هەزار کەس دەبوون . پاشاو شاژنیش بەرامبەر قازیو

حەشامەتەکە لەسەر تەختێکی نایاب دانیشتن .
سەربازەکەیان برد ، گەیشتە سەر پایەی قەنارە . هات پەتی بخەنە گەردەنی . گوتی نەختێ مۆڵەتم بدەن ، داوایەکی بچووکم هەیە . وا ڕۆیشتووە پێش ئەوەی تاوانبار لەسەری بدرێ ئەگەر داوایەکی بچووکی هەبێ بۆی دەکەن تا لەسەر دڵی نەبێتە کەسەر . منیش زۆرم حەز لێیە لە سەرەمەرگدا سبیلێکی بە دڵی خۆم بکێشم . دوا سبیلمە لەم دونیایەدا .
پاشا داواکەی ڕەت نەکردەوە . ئەویش بەکاوەخۆ سبیلی تێکردو دەمی پێوە ناو دەستی بۆ چەرخەکە برد ، سبیلەکە پێبکات .
چەرخی هێنا دەرێ . حازری کرد . خێرا ، سێ جار لەسەر یەك لێیدا : یەك ، دوو ، سێ . هەرسێ سەگ لەبەردەمی ئامادە بوون : ئەوەی هەرچاوێکی بەقەد ژێر پیاڵەیەك بوو . ئەوەی هەر چاوێکی بەقەد بەرداشێك بوو . ئەوەی هەر چاوێکی بەقەد بورجێکی خڕ بوو .
هەموو پێکۆلیان کردو مڕاندیان : « گەورەم ، ئەمر کە ! »
سەربازەکە گوتی : « فریام کەون ، لەسەرم دەدەن . »
سەگەکان پێکەوە هێرشیان بۆ قازیو حەشامەتەکە برد . هەر کەسێ کەوتە بەرێ لنگو

لووتیان گرتو فڕێیاندا ئاسمانێو هەپڕون بە
هەپڕونیان کرد .

پاشا هاواری کرد : « کاکە ، لەسەری نادەم .
بابە ، لەسەری نادەم » بەڵام سەگە هەرەگەورەکە.
پاشاو شاژنی گرتو تێیهەڵدانە ئاسمان .

سەربازەکان هەموو زەندەقیان چوو .
پەرتانپووتانیان پێکەوت . ئەو خەڵکە بە جارێ
دەخالەتی سەربازەکە بوون « ئێمە کردمان تۆ
نەیکەی . پیاوی چا بە مەمانکوژە . دەتکەین بە
پاشا ، کچیپاشات دەدەینێ . »

سەربازەکە سەگەکانی هێور کردەوە .

خەڵکەکە گالیسکەی پاشایان هێناو
سەربازەکەیان هاویشتە ناوێ . هەر سێ
سەگەکەش تەقلەکوت هاتن لەبەردەم سەربازەکەدا
وەرکەوتنو هاواریان کرد : « هوڕای ! » . منداڵە
وورتکەش بە پەنجەی دەست فیکەیان کێشا .
سەربازەکان سەلامیان بۆ وەرگرت .

ئیدی لەو رۆژەوە کچی پاشا کۆشکی پۆڵابەندی
بەجێ هێشتو بوو بە شاژن ـ قسەی خۆمان بێ
خۆیشی حەزی لێبوو ـ .

یەك هەفتەی تەواو شاییو گۆوەند گەڕا .
سەگەکانیش تەبای وان چوونە سەر خوانی خواردن
و ـ بێی تۆ ناخۆش ـ تێریان ـ کفتە ـ خوارد .

# کچۆڵەی شقارتە فرۆش

سەرمایەکی زۆر تووش بوو . بەفرو ڕەهێڵە بوو . ڕۆژ لەسەر ئاوابوون بــوو . ئەو ئێوارەیە دوا ئێوارەی ساڵــی کۆنو سەرەتــای ساڵی تازە بوو .

کچۆڵەیەکی هەژار بە سەرکۆتیو بە پێخواسی لەبەر ئەو سەرمایەدا ، بەو تاریکەیە بە کۆڵانانەدا دەگەڕا . ڕاستی کە لە ماڵێ هاتە دەرەوە جووتـــە سۆلێکی لەپــێدا بــوو . بــەڵام ســۆلەکان زۆر گەورەبوون . ئەوەندە گەورە بوون دایکی جاروبار بەسەر پێی خۆیەوە دەکردن .

کە بە ڕێگادا دەڕۆیشت لە هیکەوە دوو ئوتومبیل گڤڤەیان هاتو بەلایەوە تێپەڕین ، ئەویش لە ترسان بازێــکی هــەڵداو دەرپــەڕی . سۆلەکانــی لەپێ بوونــەوەو پەڕینــە ئــەو لاوە . لنگێــکی دۆزیــەوە ، بــەڵام لنــگەکەی دی کەوتە دەســت

منداڵێکی چەتوون • فڕاندی‌و گوتی کە کوڕم بوو بۆی دەکەمە لانك •

کچۆلەکە بەم شێوەیە لە کۆڵانان دەگەڕاو دەسووڕا • پێیە بچووکەکانی تەزی بوون‌و شین‌و مۆر هەڵگەڕابوون • هەندێ دەستە شقارتەی لە چارۆگەیەکی کۆن پێچا بوو • دەستەیەکیشی بە دەستەوە گرتبوو • شقارتەی دەفرۆشت • بەلام ئەو ڕۆژە تا ئێوارێ کەس هیچی لێ نەکڕی‌و کەسیش فلسێکی پێ نەبەخشی • بەو سەرماو سۆلەیە ، بە زگی بەتاڵ‌و برسی‌یەوە دەگەڕا • لەخۆی بێ‌کەس‌و بێ‌نەواتر نەبوو • وای لەو بچکۆلە بەستەزمانە ! کلۆکلۆ بەفر دەکەوتە سەر پرچە درێژو جوانەکەیەوە • پرچی ئەوەندە جوان بوو لە پشتەوە گلۆوازەی کرد بوو • بەلام خۆی قەت بیری لە جوانیی خۆی نەدەکردەوە • بە خەیاڵیدا نەدەهات کە کچێکی ئەوەندە قشت‌و ژیکەڵەیە •

ئەو ئێوارەیە روناکی لە پەنجەرەی خانووەکان دەدرەوشایەوە • بۆنی چێشت‌و قازی بریانی کۆلانی پڕ کردبوو • چونکە ئەو ئێوارەیە ئێوارەی سەری ساڵی تازە بوو •• ئەدی ، کچۆلەکەش هەر بیری لەو ڕۆژە دەکردەوە •

قوژبنێکی دۆزی‌یەوە ، دوو خانوو کەیشتبوونە یەکترو یەکێك نەختێ لەوەی‌تر زیاتر هاتبووە

دەرێ . لەو قوژبنە هەلتوتر کاو پێیەکانی هەلکێشایەوە بنەخۆی و گرمۆلەی کرد . قەت سەرمای وای نەدی بوو . نەشیدەوێرا بچێتەوە مالێ چونکە ئەو ڕۆژە هیچ شقاتەی نەفرۆشتبوو . یەك فلوسی پەیدا نەکرد بوو . ئەگەر بە دەستبەتالی بچووبایەوە باوکی لێیدەدا . ئەگەر ئەوەش نەبا ، خۆ مالەوەش هەر ساردوسڕە ، پێخەفیان ساپیتەیە. پووش و پەلاش و بەڕەی ناو دەرزو دەلاقەکان (با) ناگێڕنەوە .. وورشەی دێ دێتە ژوورەوە .

هەروەختبوو دەستە بچکۆلەکانی بقەسرن . وای !! ڕەنگە قلە شقارتەیەکی بچووکی بەکەلك بێ . هەر ئەوەندە غیرەت بکات و قلێك لە دەستەشقارتەکە دەربێنێ و لە دیواری بخشێنێ دەتوانێ پەنجە سڕەکانی گەرم بکاتەوە . تانی لە خۆیدا قلێکی دەرهێنا . بە دیواریدا هێنا . ووش . ووش . کلفاندی و گڕی گرت .

بروسکەیەکی گەرم و گەشی هاویشت . دەستی تێوەرهێنا . دەتگوت مومێکی بچکۆلانەیە ، چرایەکی گەشە . کە لە ئاگرەکە ڕاما وای زانی لەبەر سۆبەیەکی ئاسنی گەورەی بزرمارکوت دانیشتووە. ئاگرەکەی باش دەسووتا . دلی بە گەرماییەکە بووژایەوە . بەلام کە پێیدەرهێنا بیداتە بەر سۆبەو گەرمی بکاتەوە. پرت ! ئاگرەکە کوژایەوە. سوبەکە

بزر بوو• دارکێکی سووتـاوی بەدەست مایـەوەو بـەس •

قلێکی تری دەرهێنا • دایگیرساندو چەخماخەیدا. دونیای روناك کرد• تەماشای کرد دیواری بەردەمی وەکو شووشە وا روون بوو• ژوورەوەی لێ دیار بوو. ژوورەکە مێزێکی تێدا بوو • مـێزەکە قوماشێکی سپی بەسەردا هەڵکشا بوو • تاقمە فەخفووری یەکی رێكوپێکی لەسەر بوو • قازێکی سوورکراوەشی لەسەر بوو• خۆخو سێوی بەسەردا بڵاوکرابووەوە. تامو بۆیەکی زۆر خۆشی لێدەهات • لەوەش خۆشتر ئەوەبوو کە قازەکە لەناو فەخفووری یەکەوە بازیدا دەرێ • چەقۆیەكو چەنگاڵێکی بە دندووکەوە گرتو بە لەنجە بۆ لای کچەکە هات • لەوکاتەدا ؛ پرت ! دنکە شقارتەکە کوژایەوە • لە دیواری ساردو رەقو ئەستوور بەولاوە سیچی لەبەردەمدا نەما •

کچە قلێکی تری لێدا • کە ئاگرەکە پێبوو . وای زانی لەژێر جوانـترین درەخـتی ( کریسماس )دا دانیشتووە • درەختەکە زۆر لـەو درەختـە زلترو رازاوەتر بوو کە پار سەری ساڵ لە شووشەبەندی دوکانـی دەوڵەمەندێـكدا چـاوی پـێ کەوتبوو • درەختەکە هەزاران مۆمـی لەنـاو چلەسەوزەکاندا دەبریسکایەوە . گەلێ وێنەی ڕەنگاو ڕەنـگی گەورە چاویان تێبڕیبوو ، وەکو ئەو وێنانە وا بوون کە

له پەنجەرەی دوکانداره‌کەدا بوون • کچه بە پەرۆشی هەردوو دەستی بۆ درێژکرد • پرت • شقارتەکە کوژایەوه • مۆمەکانی سەرچلی درەختەکە هەر بەرزبوونەوە تا هەموو بوون بە ئەستێرەی پرشنگدار • ئەستێرەیەك داڕژاو کلکە ئاگرێکی سوورو گەش‌و درێژی لەناوەندی ئاسمانەوە بە دوو خۆیدا ڕاکێشا • کچە لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئای، های، ئەوە پیاوچاکێك عەمری خوای کرد •» چونکە داپیری رەحمەتی هەموو جارێ کە لەسەر کۆشی خۆی دادەنا، دەیگوت کە ئەستێرەیەك دەکشێ ئەوە پیاوچاکێك دەمرێ‌و ڕوحی بەرزدەبێتەوە بارەگای یەزدان •

کچە قلەشقارتەیەکی تریشی دەرهێناو بە دیوارەکەی داهێنا • شقارتەکە گڕی سەندو ئەو ناوەی ڕوناك کردەوه • تەماشای کرد داپیری سەرسپی لەنێو ڕوناکی‌یەکەدا وەستا بوو • تا بڵێی جوان‌و نوورانی بوو • تا بڵێی میهرەبان‌و دڵنەرم بوو • کچە کە چاوی پێ کەوت هاواری کردێ: «داپیره، بەجێم مەهێڵە • لەگەڵ خۆتم ببه • دەزانم ئاگرەکە بکوژێتەوه تۆش دەڕۆی • وەکو سۆبە گەرمەکەو قازە بریانی‌یەکەو درەختە جوانەکە بزر دەبیت •»

یەك لەسەر یەك دنکە شقارتەی لێدا • چونکە

نەیدەویست داپیرەی بڕواو بەجێی بێلی ٠ شقارتەکانیش ئەوەندە گەش‌و جوان دەدرەوشانەوە ٠ ببووە ڕۆژی نیوەڕۆ ٠ داپیرەی لەجاران کەڵەگەت‌و نازدارتر بوو ٠ لێی‌هاتە پێشەوەو خستیە سەرباسکی‌و هەردووکیان بە شادی‌و خۆشی هەلفڕین‌و بەرەو ئاسمان بەرز بوونەوە ٠ کە نەسەرمای لێ‌بوو ، نە برسێتی‌و نە ترس . بە دڵنیایی لە سێبەری خوادا ژیان ٠

بۆ بەیانی ، سبەینێ زوو دیتیان کچەکە بە ڕوومەتی سوورو لێوی خەندانەوە لەو قوژبنە کەوتووەو قنیانی لەبەر بڕاوە ٠ دوائێوارەی سالی رابردوو لەسەرمان ڕەق هەڵکەڕا بوو ٠

بەیانی سالی تازەش کە گزنگی‌دا ، تیشکی لە تەرمە بچکۆلانەکەی کچەدا . کە لەو قوژبنە ساردەدا ڕاکشا بوو ، دەستە شقارتەیەکی سووتاویشی لەتەك کەلەکە ببوو ٠

خەڵکی کە چاویان پێ‌کەوت ، گوتیان : « بەستەزمان ! ! دیارە ویستوویەتی بەم شقارتانە خۆی گەرم بکاتەوە ٠ » بەلام کەس نەیدەزانی کچە ئەو شەوە چەند شتی جوانجوانی دیوەو لەبەر چ ڕوناکی‌یەکدا بە دیداری داپیری شاد بووەو هەردووکیان پێکەوە چوونەتە ئاهەنگی سالی نوێ ٠

# دوو دڵدار

تۆپو مزراح لەگەڵ هەندێ لەیستۆکی تر کەوتبوونە ناو چەکمەزەی منداڵێکەوە . ڕۆژێکیان مزراح بە تۆپی گوت : « ئەرێ ، ئێمە پێکەوە لەیەك شوێندا دەژین ، بۆچی مێردم پێ ناکەیو ببینە هاوسەری یەکتر . »

تۆپەکە کە پێستەیەکی مەراکشی پۆشی بوو . زۆری ڕا لەخۆی بوو . خۆی پێ زۆر جوانو نازدار بوو . دەعیەی نەهێنا هەر وەڵامیشی بداتەوە .

ڕۆژی پاشتر خاوەنی لەیستۆکەکان هاتو بۆیاغی سوورو زێڕینی لە مزراحەکەداو بزمارێکی سفری تێ گرت . مزراح خوڵایەوە . یەککو شتێکی بەنرخ بوو !! بە تۆپی گوت :

«سەیرم کە ، چەند جوان شایی دەکەم . ئێستا چ دەڵێی ؟ مێردم پێ ناکەی ؟ منو تۆ بۆ یەك باشین . لێك دەوەشێینەوە . تۆ باز هەڵدەو منیش شایی

دەکەم • کەس بەقەد ئێمە بەختەوەر نی‌یە . تۆپ گوتی : « قسەی وا چۆن دەکەیت ؟ چما نازانی داك‌وبابم پێستەی مەراکشین‌و تەپەدۆرێکی بەنرخم لەناو زگ‌دایە • »

مزراح گوتی : « منیش لە دارجاو کەوتوومەتەوەو پاشا خۆی لەسەر تەختەیەکی تایبەتی دەمخولێنێتەوە • »

تۆپ گوتی : « جا بەتەمای بڕوات پێ‌بکەم ؟ »

مزارح گوتی : « یاخوا ، ئەگەر قسەکەم درۆ بێ. جارێکی‌تر نەخولێمەوە • »

تۆپ گوتی : « کەس بەدۆی خۆی نالێ ترشە • شتی وا قەت نابێ . ئاخر من نیوەی مارەییم لە چۆلەکە هاتووە • هەموو جارێ کە دەچمە ئاسمانەوە، سەر لە هێلانەکەی دەردێنێ‌و دەڵێ: (دەکەی؟) منیش جارێکیان لە دڵی خۆمدا گوتم « ئا » ، ئەوەش نیوەی مارەیی‌یە • بەڵام پەیمانت دەدەمێ هەرگیزاو هەرگیز لەبیرت ناکەم . »

مزراح گوتی : « ئەوەندەش هەر باشە • حرابی چی‌یە . »

لەوە زیاتر یەکتریان نەدواند •

رۆژی دووەم کوڕەکە تۆپی دەرهێنا • تۆپەکە وەکو مەل کەوتە ئاسمانەوە . مزراح تەماشای

کرد . تۆپه‌که ئه‌وه‌نده به‌رزبووه‌وه له مه‌ودای چاو چووه ده‌رێ . که ده‌چووه ئاسمان‌و ده‌هاته خوارێ ، (زرم) به زه‌وی ده‌که‌وت‌و بازێکی بڵندی هه‌ڵده‌دا بۆیه‌ش وای ده‌کرد چونکه تۆپێکی بزۆز بوو . ته‌په‌دۆری له‌ناو زگ‌دا بوو . هه‌شت جار چووه ئاسمان‌و هاته‌وه . جاری نۆیه‌م که چووه ئاسمان نه‌هاته‌وه . ئاوو ئاو چوو . ئه‌وه‌نده‌ی کوڕه لێی گه‌ڕا نه‌یدۆزی‌یه‌وه . ئیتر لێی بێهیوا بوو .

مزراح هه‌ناسه‌یه‌کی ساردی هه‌ڵکێشاو گوتی: «ئه‌من ده‌زانم له‌کوێ‌یه . چووه مێردی به چۆله‌که کردووه . ئێستا له هێلانه‌ی چۆله‌که‌دایه .»

مزراح تا زیاتر بیری له تۆپه‌که ده‌کرده‌وه پتر ئه‌شقی ده‌بوو . هه‌ر چه‌نده تۆپ مێردی به مزراح نه‌کرد و دڵی به‌یه‌کێکی تردا به‌ڵام هه‌ست‌و سۆزی جۆشاندو جولاندی . مزراح که‌وته سه‌ماو خولانه‌وه . به‌ڵام بیری هه‌ر له‌لای تۆپه‌که بوو . تا ده‌هات له‌به‌ر چاوی جوانتر ده‌بوو .

چه‌ند ساڵێکی به‌سه‌ردا تێپه‌ڕی . ئه‌شقی مزراح کۆن بوو . خۆیشی که‌وته ساڵانه‌وه . ڕۆژێکیان تازه ڕه‌نگ‌کرابوو . ببوّوه مزراحێکی زێڕ که بازێکی هه‌ڵداو خولایه‌وه‌و مه‌یی . له هیکه‌وه بازێکی توندی هاویشت‌و بزر بوو .

ئەم لا گەڕان ، ئەو لا گەڕان
گەڕان نەیاندۆزی‌یەوە . قیسی ژێرزەمینیش

مزراح بازی‌دابوو ، چووبووە ناو توونی
سەرشۆرکێ کە پڕاوپڕی کۆنەشرە بوو . لاسکە
کەڵەمو زبڵو تەنی تێدا بوو . مزراح لەدلی خۆی‌دا
گوتی : «ئێرە زۆر ناخۆشە بۆمن . لێرە ناحەوێمەوە .
بۆیاغەکەم زوو دەتەکێ . پەککو کەوتمە ناو چ
سۆرەوبۆران ؟ »

بە تی‌ی چاوان سەیری قاچکەکەڵەمێکی
شەق‌بردووی کرد . لەولاوە شتێکی خڕی کەوتە
بەرچاو . لە سێوی کۆنی دەکرد . بەڵام سێو نەبوو .
تۆپەکە بوو ، کەوتبووە سەربانو بەناو
دووکەڵکێشەوە شۆڕببووەوە ناو توونی
سەرشۆرکێ .

کە تۆپەکە چاوی بە مزراح کەوت ، گوتی :
« بەخوای چا بوو یەکێکی خۆییم هاتە لا . تێر پێکەوە
دەدوێین . راستە لە پێستەی مەراکشی دروست
کراوم . کچێکی عازەب بەرگی درووم . تەپەدۆرێکی
جوانم لەناو زگ‌دایە ، بەڵام کەس بەخەیالی‌دا نایە
تەماشام بکات . ئەو کاتەی کەوتمە ناو
دووکەڵکێشەوە زۆرم نەما بوو مێرد بە چۆلەکە
بکەم . کەچی ئاوهام بەسەر هات . ئەوە پێنج سالە
تەڕوشێ هەڵدەمژم . بڕوا بکەن پێنج سال بۆ کچی

عازەب کەم نی‌یە ، زۆر زۆرە • »

بەلام مزراح وورتەی لەدەم نەهاتە دەرێ . دلخوازی گۆرینی هاتەوە یاد . تا پتر گوێی لە قسەی نۆپ بوو زیاتر لێی مسۆگەر بوو ئەوە هەبێو نەبێ کۆنە دلخوازی خۆیەتی •

لەوکاتەدا کارەکەر هات توونی سەرشۆرێ پاکژ بکاتەوە • کە چاوی بە مزراحەکە کەوت قیژاندی : « هوررا ، ئەوەتا مزراحی زێرین • »

مزراح خەنی بوو . لەو زندانە رزگاری بوو • چووە دەرەوە .

بەلام کەس باسی تۆپی نەکردو مزراحیش باسی کۆنە دلخوازی خۆی بۆ کەس نەگێرایەوە • دلخوازێك پێنج سال لە توونی سەرشۆرکێ بکەوێو نموشێ بکێشێ ، رەونەقی نامێنێ • بەراست ، ئەگەر لەتوونی سەرشۆرکێ تووشی یارەکەت ببیت هەرناتەوێ خۆی لێ بەخودان بکەیتو بیناسیتەوە • وانی‌یە ؟ .

# چەرخو فەلەك

هەبوو نەبوو بازرگانێکی زۆر دەولەمەند هەبوو. ئەوەندە دەولەمەند بوو پێی‌دەکرا جادەیەکی تەواو زێڕڕێژ بکات . یەك بەکۆلانێ زێڕی هەبوو . بەلام پارەکەی خـەرج نەدەکـرد . درهەمێـکی سـەرف بکردبایە دینارێکی دەخستە جـێ . ئـەو تـەرزە بازرگانە بـوو . زۆری نەبـرد ئـەمری هـەقی بەجێ‌گەیاند .

ئەو سامانەی کۆی کردبووەوە بـۆ کوڕەکەی بەجێما . کوڕە دڵتەڕ بوو . قـەت بێدڵـی خـۆی نەدەکرد . بە پای پیلان پارەی دەبەخشی . بەکەیفی خۆی رای‌دەبوارد . هات‌وچـۆی تیـاترۆی دەکرد . دیناری دەکردە کوش‌قاقـەزو یاری‌پێ‌دەکرد . لـە دەم گۆمو ڕووباران ، لەباتی بـەرد ، یـاری مراوی نێرانەومێیانەی بە لیرەی زێڕ دەکرد . پارەکـەی لێ‌قەزا بوو . وا نەبا لەکۆلی نەدەبووەوە . چـاکی کرد لە کـۆڵ خـۆی کردەوە . وای لێ‌هـات لـە

جل‌وبه‌رگیش . له‌ چاره‌گه‌دیناریك زیاتری نه‌ما . جو ته‌سۆلێك‌و كۆنه‌ كراسێكی ئاوداماں زیاتر هیچی له‌به‌ردا نه‌ما .

براده‌ره‌كانی لێی‌ڕه‌وینه‌وه‌ . وه‌كو جاران په‌شته‌په‌شتیان له‌به‌ر نه‌ده‌كرد . له‌گه‌لی نه‌ده‌چوونه‌ گه‌ڕانێ .

ئه‌و كوڕه‌ براده‌رێكی گه‌نج‌و دلسۆزی هه‌بوو . براده‌ره‌كه‌ی چه‌رخ‌وفه‌له‌كێكی به‌ دیاری بۆ ناردو گوتی : « ئه‌مه‌ت هه‌بێ به‌سته‌ . هیچ ئیش‌وكار مه‌كه‌ . » جا چما چ ئیش هه‌بوو ، داخوا ده‌یكات یا نایكات .

به‌ڕاستی ئه‌و چه‌رخ‌وفه‌له‌كه‌ شتێكی سه‌یر بوو. بتجوولاندایه‌وه‌ . چه‌رخ وفه‌له‌كه‌كه‌ ده‌فڕی‌و ده‌كه‌وته‌ ئاسمانێ .

كوڕه‌ چووه‌ ناو چه‌رخ‌وفه‌له‌كه‌كه‌ ، دانیشت . ده‌سكه‌كه‌ی بادا . ووش ، ووش ، ووش . چه‌رخ‌وفه‌له‌ك فڕی . به‌سه‌ر دوكه‌لكێشی بانان‌و به‌سه‌ر هه‌وری ئاسمانان‌دا فڕی. ڕۆیشت. له‌ناكاو قرچه‌یه‌ك له‌ چه‌رخ‌و فه‌له‌كه‌كه‌ هه‌ستا . كوڕه‌ هه‌تره‌شی چوو نه‌وه‌ك چه‌رخ‌وفه‌له‌ك گرده‌بڕبشكێ‌و بكه‌وێته‌ خواره‌وه‌ . به‌لام چا بوو قرچه‌كه‌ چ نه‌بوو . هی نه‌وه‌ بوو چه‌رخ‌وفه‌له‌ك چووه‌ باریه‌ك‌و توندتر بوو .

هەر ڕۆیشت ، ڕۆیشت، تا گەیشتە تورکستان. لەناو دارستانێکدا نیشتەوە چەرخوفەلەکەی لەناو پووشوپەڵاشدا شاردەوەو خۆی بە پێیان چووە ناو بازێڕی .. تورکیش هەموو بەتای سۆنو کراسێ بوون بۆیە هیچ کێشمەودۆخەی نەهاتە ڕێ.

یەکەم جار تووشی دایەنێك هات ، کۆرپەیەکی خەپەتۆڵەی بەئامێزەوە بوو · بانگی کرد: «دایەنەکە، زەحمەت نەبێ پرسیارێکم هەیە · ئەرێ ئەو کۆشکە گەورەیە چی‌یە لە دوورەوەی شار . پەنجەرەی وا بڵندە . »

دایەنەکە وەڵامی دایەوە : « ئەوە حەرەمسەرای کچی پاشایە · فالچی خەبەریان داوە ئەو کچە تووشی دڵداری‌یەکی ناخۆش دەبێ ، بۆیە ئەو کۆشکەیان بۆ لەوێ کردووە · پاشاو شازبی لێدەرچێ کەس نایگاتێ . »

کوڕە بازرگانەکە سوپاسی دایەنەکەی کردو گەڕایەوە دارستان · چووە ناو چەرخوفەلەکەی . دەسکەکەی بادا · بەسەربانانیدا فڕی . چوو ، چوو ، چوو بە پەنجەرەکەدا چووە ژووری کچی پاشا ·

کچە لەسەر قەنەفە ڕاکشا بوو . خەوی لێکەوتبوو · ئەوەندە ناسكو نازدار بوو ، کوڕە ، خۆی پێ نەگیرا (مرچ) ماچی کرد · کچە بەناگا هات . زۆر ترسا . بەڵام کوڕە دڵی دایەوەو کوتی :

(مەترسە ئەمن خوای تورکانم ٠ لە ئاسمانەوە بۆ سەردانی تۆ هاتووم . ) ٠ کچە نەدیتکە بوو . قسەکەی لەدڵ چەقیو بڕوای کرد ٠ دووبەدوو دانیشتن ٠ کوڕە دەستی پێکرد هەقایەتی چاوەجوانەکانی کچەی گێڕایەوە ٠ گوتی ئەو چاوانە وەکو گۆمی مەندوقووڵ وانو خەیاڵ وەکو پەری بەحری مەلەوانییان تێدا دەکات ٠ هەقایەتی هەیبەی گێڕایەوە گوتی : « ئەو هەیبە جوانەت وەکو چیایەك وایە بەفر دای پۆشیبێو پەلە سەهۆلی وێنەداری جوانو بریسکاوەی تێدا بێ ٠ پاشان باسی حاجی لەقلەقی بۆ کرد کە هەموو ساڵێ بێچووی جوان جوان هەڵدێنێ ٠

قسەو هەقایەتەکانی زۆر خۆشو بەتامبوون ٠ سیحراوی بوون . بەدەم ئەم قسە خۆشانەوە داوای لە کچە کرد کە مێردی پێبکات ٠ کچە قایل بوو . بەڵام گوتی : «دەبێ ڕۆژی شەموو بێیتەوە ٠ ئەو کاتە پاشاو شاژن بۆ چا خواردنەوە دێن . با ئەوانیش ئاگادار بن . ئەگەر بزانن مێرد بە خوای تورکان دەکەم بێشك زۆریان کەیف پێدێت ٠

بەڵام دیارە تۆ هەقایەتی زۆر خۆش دەزانی ٠ دایكو باوکیشم زۆریان حەز لە هەقایەتە ٠ دایکم هەقایەتی وای پێخۆشە باسی جوانیو داوێنپاکی تێدا بێ ٠ باوکیشم حەزی لە هەقایەتی وایە کە

نوکتەو پێکەنینی تێدابێ ٠ هەقایەتی ئاوایان بۆ بگێڕەوە . باشە ؟

کوڕە گوتی : « زۆر باشە ٠ کەوابوو لەباتی نیشان هەقایەتان دێنم . »

کچە شیرێکی زێڕی پێشکەش کرد کە زۆری کەلك لەو شیرە وەرگرت ٠ ماڵاوایی کردو ڕۆیشت. بەسواری چەرخوفەلەکەکەی ڕۆیشت ٠ چوو ، جارێ زوو کراسێکی نوێی بۆ خۆی کڕی ٠ پاشان چوو لە کونجێکی دارستانەکە دانیشتو هەقایەتی هەڵبەست ٠ دەبا بۆ ڕۆژی شەموو هەقایەتەکان تەواو بکات . هیچ ئەزیەتی پێوە نەدیت ٠ بۆ رۆژی شەموو هەقایەتەکان ئامادە بوون .

پاشاو شاژنو سەراپای بارەگا چوون چایەك لەلای کچە بخۆنەوە ٠ کە ئەو خەبەرەیان زانی ٠ هەموو بە خۆشیو شادی بە پیر کوڕەوە چوون ٠ کوڕە هات . دانیشتن .

شاژن داوای لێکرد ، گوتی : « هەقایەتێکمان بۆ بگێڕەوە ٠ بەڵام هەقایەتێکی وا بێ سوودی هەبێ . ئەقلی تێدابێ . »

پاشا گوتی : « بەڵام پێکەنینیشی تێدا بێ . »

کوڕە گوتی : « بەچاوان » ٠ دەستی بە گێڕانەوەی هەقایەتەکە کرد ٠

گوێ بگرن · ئەو هەقایەتە خۆشەی گێڕایەوە ،

گوتی :

هەبوو ، نەبوو ، دەستەشقارتەیەك هەبوو · ئەو شقارتانە زۆر شانازی‌یان بە خۆیانـەوە دەکـرد . چونـکە لە بەرەبابێکی ڕەســەن بــوون · درەختی بابەگەورەیـان ، دارسنەوبـەرێك بــوو · لـەو دارسنەوبەرە کرابوونەوە کە دارێکی زۆر گەورەو بەتەمەنی دارستان بوو ·

شقارتەکان لە چێشتخانەدا لە بەینی چەرخێكو مەنجەڵێـکی بەقوڵپ لەســەر ڕەفـکەیەك پاڵیـان دابووەوە· باسی سەردەمی گەنجێتی خۆیان دەکرد· دەیانگوت : ئـەو کاتەی کـە هێشتا بەســەر چڵی سەوزەوە بووین زۆر لە خۆشی‌و شادی‌دا بووین · بەیانی‌و ئێواران خوناومان لەسەر دەکەوت · کـە ڕۆژ بەدەرەوە با تیر خۆمان دەدایە بەر هەتاوێ · تەیروتاڵــی بچکۆڵەش هەقایەتــی خۆش خۆشیان بۆ دەگێڕاینەوە ·

وای چەند خۆش بوو کە لەسەر درەختی خۆمان بووین‌و تەماشای ئەو دارستانە چڕوپڕەمان دەکرد· درەختەکانی‌تر تەنیا هاوینان بەرگیان لەبەر بوو · کەچی بەرەبابی ئێمـە بەهاوین‌و زســتان بەرگــی سەوزمان پۆشی بوو ·

ئاخ ، دونیا بۆ کەس نامێنێ ! رۆژێکیان داربڕ هاتن • کووکەیەکی گەورەیان نایەوە • لەم هەرایەدا خێزانەکەمان کوێر بووەوە • گەورەکەمان بوو بە دارئالآی کەشتییەکی نەشمیلانەو دلی کوێی بویستایە بە ناو ئاودا بەهەر چوار ئیقلیمی دونیادا دەگەڕا •

چڵەکانی تر ، هەریەکە کەوتە شوێنێك • ئێمەش پیشەمان بوو بەوە کە ڕوناکی بە خەڵك ببەخشین • هەربۆیەش ئێمەی ماقووڵو خانەدان کەوتووینەتە چێشتخانە •

مەنجەڵی بەقوڵپ ، کە لەتەنیشت شقارتەکان ، دانیشتبوو گوتی : « هەقایەتی من پێچەوانەی ئەمەیە • من لەو ڕۆژەوە هاتوومەتە دونیاوە تا ئێستا هەر دەبرژێمو دەکوڵێم • بەڵام زۆر بەو ئازارەوە سەربەرزم • لەوماڵەدا لە هەموو کەس گەورەترم •

شادی هەرە گەورەم لە دونیادا ئەوەیە کە دوای چێشتخواردن ئاوها بە خاوێنو باوێنی لەسەر ڕەفکە پاڵ بدەمەوەو لەگەڵ هاوڕێکانمدا قسەی خۆش بکەم •

ئێمە بەدەوام لە ژوورێین • تەنیا مام دەولك نەبێ جاروبار بۆ ئاوهێنان تا حەوشەی خوارێ دەچێ •

یەك قاسیدمان هەیە قسەمان بۆ دێنێ • ئەویش زەمبیلەی بازاڕە• بـەلام هەمیشە قسـەی ناخۆشی پێیە • زۆر لەمـێژ نییـە کۆنەمەنجەلێك لە داخی قسەکانی لەرزی هاتی ، هەژا ، کەوتو پارچەپارچە بوو • بەلام مەنجەلێکی زۆر لاسار بوو •

ئنجا چەرخ وەدەنگ هاتو گوتی : « ئێوە زۆرتان چەند لێدا » کە وای گوت بەردوئاسن لێك خشانو چەخماخەی دا • گوتی : « ئەدی ئێوارەی خۆش ئاوا دەبێت ! »

شـقارتەکان گوتیـان : « باشـە ، بابـزانین گرنگترین کەسمان کێیە ؟ »

مەنجەلێکی گلێنە لەوێ بوو • هەلیدایەو گوتی : « ئەمن حەز ناکەم باسی خۆمتان بۆ بکەم • کە بەزمی ئێوارە دەستی پێکرد ئەو حەلە باسی شتێکی واتان بـۆ دەکەم کە هەمـوو کەس بیـزانێ • شـتێکە هەموومان دەتـوانین بـە شادومانییـەوە بچینـە ناویەوە • زۆر خۆشە . لە نزیك بەلتیکە . لە کەناری دانیمارکە • »

فەخفووری‌یەکان پێکەوە گوتیان « هەستانێکی باشە ، ڕەنگە هەقایەتەکەی خۆش بێ • لەوانەیـــە بەدلی ئێمە بێت ؟ »

مەنجـەلەکە دەسـتی پـێکردەوە : « ئـەدی ،

گەنجێتم ، لەوێ ، لەناو خێزانێکی کرۆهێمندا بردە سەر .

هەموو کەلوپەلەکان جوان جوان بۆیاغ کرابوون. زەوی یەکە پاك پاك شووزابوو . هەر دوو هەفتـــە جارێك پەردەیان دەگۆڕین . »

گەسك لەولاوە هەڵی دایەو گوتی : « چەند بـە زانایی هەقایەتەکە دەگێڕێتەوە . دەڵێی پیرەژنەو لەبەر ئاگردان دانیشتووەو هەقایەت دەگێڕێتەوە ! هەقایەتەکەی چەند خۆشە ! »

دەولك لێی وەرگرتەوە : « راستە . منیش زۆرم رالێ یە . »

لەخۆشی یان بازێکی هەڵداو گوتی : « پلوتك » کەوتە سەر زەوی .

مەنجـەڵ کە هەقـایەتەکەی تـەواو کـرد . دوابەندیشی وەکو سەرەتاکە خۆش و بەتام بـوو . ئەوەندە خۆش بوو هەموو فەخفوریەکان لە خەنـی خۆشی یان کەوتنە تەقەتەق . گەسك چوو چەنگێك کەوەری سەوزی هێناو تاجێکی لەسەری مەنجەڵەکە نا . دەیزانی ئەوانەی تر بەم کارە سڵ دەبن ، بەڵام ئەویش حسێبی خۆی کردبوو . گوتی : « ئەگەر من ئەمڕۆ تاجێك لەسەری ئەو بنێم . ڕۆژێك دێ ئەویش تاجێك لەسەری من دەنێت . »

هالآوی ئاگریش گوتی : « منیش سەما دەکەم ! کەوتە هەڵپەڕین . وای بتاندیبایە چۆن لەسەر یەك لاق هەڵدەپەڕیو گەردنی بۆ ئاسمان هەڵدەکێشا .

کۆنە سەرپۆشی کورسی یەك لە قوژبنێك کەوتبوو. ئەوەندەی تەماشاکرد تا شەقی برد . هالآوی ئاگر گوتی : « ئەرێ ، بۆ تاجێکیش لەسەر من نانێن .» تاجێکیشیان لەسەری ئەو نا .

شقارتەکان کە ئەمەیان دیت ، لە دڵی خۆیـاندا گوتیان : « پەککو ! ئێمە کۆمەڵێکی چەند تـەباو تفاقین . »

پاشان ڕوویان لە قۆری چا نا گۆرانی یەك بڵێ . قۆری گوتی سەرمـامەو تـا نەکوڵـێم گـۆرانیم پێ ناگوترێ . هەرچەندە بە بەریدا کەوتن لە کەڵی شەیتان نەهاتە خوارێ . گوتـی ئەگەر لـە ژووری دانیشتن‌و لەسەر مێزی بەردەم پاشاو شاژن نەبێ گۆرانی ناڵێم .

کۆنە پەڕاموچەیەکی نووسـین لە دەلاقـەیەك کەوتبوو . کارەکەرەکە پێی دەنـووسی . هیچیـان دەرهەق نەدەزانی ئەوە نەبێ کە بەشی هـەرە زۆری لەدەویت نقووم کرا بوو . ئـەویش شـایی بـەوە دەهات‌و دەیگوت: « مادام قۆری چا گۆرانی ناڵێ . پێویست ناکات . لە دەرەوە ، بولبولێك لەناو قەفەز

دایە . ئەگەرچی دەرسیشی نەخوێندووە بەڵام زۆر گۆرانی دەزانێت . با ئەو گۆرانیمان بۆ بڵێت . »

کتلی ، کە یەکەم گۆینەدەی چێشتخانەو دەستەخوشکی قۆری بوو ، گوتی : « من بەلامەوە باش نی‌یە گوێ لە گۆرانی باڵندەی بیانی بگرین . چما ئەو مەلە هاونیشتمانی‌یە ، چی‌یە ؟ با زەمبیلەکە ئەم بڕیارە بدات . »

زەمبیل گوتی : « دڵم زۆر سوارە . زۆر پەستم . توخوا بەزمو رابواردن وا دەبێت ؟ وا باشتر نی‌یە هەر کەسە لە شوێنی خۆی ئۆقرە بگرێت ؟ با ماندووبوونەکەمان بەفیرۆ نەڕوات . »

هەموو پێکەوە هاواریان کرد : « با دانیشننەکە تێك بدەین . »

لەو کاتەدا ، دەرگا کرایەوە . کارەکەر هاتە ژوورێ . هەموو رەپ ڕاوەستان . کەس وورتەی لەدەم نەهاتە دەرێ .

بەڵام هەموو بە دڵنیایی دەیانزانی هەرکەسە چی‌یە ؟ و چ جۆرە پیاوێکە ؟ هەرکەسە لەدڵی خۆیدا دەیگوت : « ئەگەر مەیلم لێبایە دەمکردە ئێوارەیەکی خۆش ! »

کارەکەر دەستیدا شقارتەکانو دای گیرساندن. نوێ ، چۆن کلپەیان هاتو چەخماخەیان دا .

شقارتەکان لە دڵی خۆیاندا گوتیان : « ئێستا هەموو کەس دەزانێت کە ئێمە گرنگترین شتین • دەزانێت چتۆ تیشکمان هەیە . دەزانێت چەنـد ڕوناکین • » پرت ، دامردنەوە •

ئەمە بوو هەقایـەتی کـوڕەکە • کە شـاژن گوێی لێبوو گوتی ، « بەڕاسنی هەقایەتێکی خۆش بوو • وام دەزانی لەگەڵ دەسـکە شقارتـەکان لـە چێشتخانەدام . کچەکەمانت پیرۆز بێت . حەڵاڵـت کرد • »

پاشا گوتی : « دەقەبەرمـان کردیـت • بەیـانی وەرە بیبە . » کوڕە لەو ساتەوە بوو بـە خـۆیی • تەدارەکی زەماوەندیان رێکخست • شەوێ شـار بوو بە چراخان . کێك‌و شیرناتی بەبـەر منـداڵان وەرکرا • بوو بە گوێفڕکانێ . منداڵ لـە کوچـەو کۆڵانان هەستانەوە سەر پەنجەی پێ • بە پەنجـەی دەست فیکەیان کێشا . ( خۆشی بۆ دووانە . گڕ لە هەموانە • )

کوڕە نەختێ بیری کردەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی: «وا چاکە کردەوەیەکیش بنوێنم ! »

هەستا ، تۆپترەقەو کبریت‌و چـەکوچ‌و هـەر جۆرە یارییەکی ئاگرینی بە خەیـاڵدا هـات کۆی کردەوەو خستییە نێو چەرخ‌وفەلەك‌و سـوار بوو ،

فڕی • ووش ، ووش ، ووش . وای بتاندیبایه چۆن فڕی ! چۆن هاتَو چەند بە جوانی تێپەڕی !

تورك ، هەموو لە عاجباتیان هەڵدەپەڕینو بازیان دەدا ئاسمان • سۆلیان لەپێ دەبووەو ڤرپەی دەهات بە بناگۆی‌یاندا دەڕۆیشت • ناهەق نەبوون . قەت شتی وایان نەدی‌بوو . بۆیە بڕوایـان هێنـا ئەوە خوای تورکانە کچی پاشا دەگوازێتەوە •

کوڕە ، چوو لەناو دارستانی گـۆڕین نیشت • لەدڵی خۆی‌دا گوتی : « بەپێ‌یان دەچمە نـاوشار • بزانم خەڵك چیم دەرهەق دەڵێن• » قسەکەی ماقووڵ بوو. کە چوو چاوی بەو خەڵکە کەوت هەموو سەریان سوڕما بوو • هەریەکە بەجۆرێـك بـاسی دەکرد . یەکێك دەیگوت : « بەچاوی خۆم خوای تورکانم دی. چاوی وەکو ئەسـتێرە وایـە ، ردێـنی سـپی کەفزیوینە • » یەکێکی‌تر دەیگوت : « دیم لەنـاو پالتۆیەکی ئاگردا دەفڕی . فریشتـەی نەشمیـل سەریان لەناو قەدی پالتۆکەی دەرهێنا بوو . »

وای ، شتی سەیروسۆبـەتی لەبـارەی خـۆی بیستەوە !

بۆ ڕۆژی پاشی ، کە ڕۆژی زەماوەند بوو• کوڕە بازرگان گەڕایەوە ناو دارستانەکە بۆ ئەوەی سواری چەرخ‌وفەلەکەکەی ببێ‌و بڕوا • بەڵام چەرخ‌وفەنەکی چی ؟ تا چووەوە چـەرخ‌وفەلـەکەکە سووتـا بوو ،

کلوکۆی دامردبووەوە · تومەز کوڕەکە لەکاتی وازی کردن‌دا سەرکە بزۆتێکی لەنـاو لەبیـر کردبوو . ئاگری بزۆتەکەی پێوە نووسابوو کردبوویە ڕەژوو.

جا ، کوڕە پەکی کەوت · دەسـتی بـەر بو . نەیتوانی بچێتەوە لای بووکێ .

بووکیش ئەو ڕۆژە تـا ئێـوارێ لەسەربـانی ڕاوەستاو تەماشای کرد لە هیچ لایەك دیار نەبـوو . کچەی بەستەزمان تا ئێستاش هەر لەوێ چاوەڕێیە.

کوڕە بازرگانەکەش سەری هەلگرت‌و ڕۆیشت، لەو ڕۆژەوە بەدونیادا دەگەڕێ‌و هەقایەتان بۆ خەلك دەگێڕێتەوە · بەلام هیچێکیان بەقەد هەقایەتی دنکە شقارتەکان خۆش نین .

# بـەرازەوان

هەبـوو ، نەبـوو ، کوڕەپاشـایەك هەبـوو . وولاتێکی لەبەر دەستدابوو . هەرچەندە وولاتەکەی بچووك بوو بەلام بایی ئەوەی دەکرد ژنێکی پێبێنێ. ئەویش بیری لە شتێکی وا کردەوەو کەوتبووە شوێن ئەو ئیشە خێرە .

بێگومان ئازایـەتی دەوێ بچێتـە داخـوازی کچی پاشا . بەلام لەبەر ئـەوەی کـوڕە خـۆی زۆر ناودێر بووو سـەدان کچەمـاقوول هەبـوون بـە سوپاسەوە مێردی پێبکەن ، زاتی پەیدا کردو لـە کچەپاشا چووە پێش . بەلام داخۆ کچەپاشا پێی‌رازی دەبێ ؟

با گوێ لـە هەقایەتـەکە بـگرین ، بزانـین بەچی‌دەگات . کوڕەپاشا ، کاتی خۆی کە باوکی مردو شاردیانەوە . پاش‌ماوەیەك دیتی بنەگولێك لەسەر گۆڕی باوکی ڕواوە . وای بنەگولێکی جـوان بوو !

هەر پێنج ساڵ یەكجار گـوڵی دەدا • ئەوجـارەش تەنیا یەك گوڵی دەدا • بەڵام گوڵێکی یەکجار جوانو بۆنخۆش . ئەوەندە جوان بـوو هـەرکەسێ چـاوی پێ بکەوتایە هەموو خـەمو پـەژارەیـەکی لەبـیر دەچووەوە • کوڕە بولبولێـکیشی هەبوو . دەنـگی ئەوەندە خۆش بوو دەتگوت هەمو ئـاوازی ناسـکی دونیا لە دەنووکی بچووکی ئەوەوە هـاتۆتە دەرێ •

کوڕە ، گوڵو بولبولەکەی ، هەریەکە خستە ناو قوتوویەكو بە دیاری بۆ کچەی نارد •

خەبەریان‌دایە پاشا ، گوتیان دیاری بۆ کچەکەت هاتووە • پاشا گوتی بیهێنن . دیاری‌یەکەیان بردە هۆڵی گەورە . کچەپاشا لەوێ لـەگەڵ کارەکـەران خەریکی گەمەر ڕابواردن بـوو • خـووی بـە یـاری ( میوان میوانانێ )وە گرتبوو •

کە کچە چاوی بە قوتووەکە کەوت . لە خۆشی‌یان چەپڵەیەکی توندی‌لێدا • گوتـی : « وای نـاکا ئـەم دیاری‌یە پشیلۆکەیەك بێ • » بەڵام کە قوتوویەکیان کردەوە پشیـلە نەبـوو . گوڵەجوانـەکە بـوو • کارەکەرەکان گوتیان : « ئەیەڕۆ ، چەند جوانیـان دروست کردووە • »

پاشا گوتی : « نەك هەر جوانە • ناسکیشە • »

بەڵام کە کچـە لـە گوڵـەکە وورد بـووەوە •

شاگەشکە بوو • وەخت بوو لە پڕمەی گریان بدات، گوتی : « بابە ، ئەوە دەستکرد نی‌یە • گولی بەڕاستی‌یە • »

کارەکەرەکان گوتیان : « ڕاست دەکات • گولێکی بەڕاستی‌یە • » پاشا گوتی : « لەوە گەڕێن • با بزانین قوتووەکەی‌دی چی تێدایە • »

کردیانەوە • بولبولێکی تێدابوو • بولبولەکە ئاوازێکی ئەوەندە خۆشی خوێند هەموو تاسان • زمانیان گیرا •

کارەکەر گوتیان : « شتێکی بەرزە ! ئاوقەرایی نی‌یە • » گزیرێکی دەربار کە گوێی لە چریکەی بولبوکە بوو گوتی : « ئەم باڵندەیە سازوئاوازی ژنە شیرینەکەمم دێنێتەوە یاد • دەق وەکو ئەو وایە • »

پاشا وەك منداڵێکی ساوا نزگرەی هاتێو گوتی: « ڕاست دەکەی • وایە • »

کچی‌پاشا هەڵی‌دایە « قەت دڵم بڕوایی نادات ئەم باڵندەیە باڵندەیەکی ڕاستەقینە بێت • »

ئەوانەی دیاری‌یەکەیان هاورد بوو ، گوتیان « با ، با، باوەڕ بکە • باڵندەیەکی ڕاستەقینەیە • »

کچی‌پاشا گوتی : « دە بەرەڵای کەن ، بزانم ، دەفڕێ • » •

هەرچەندە دیاری یەگە زۆر نایاب و بێوێنە بوو، کچە دڵی پێ نەرم نەبوو. لە دوو کوڕەپاشای نەنارد.

بەڵام کوڕەپاشا نەتەی بەرنەدا. دەموچاوی خۆی بە بۆیاغی ڕەش و قاوەیی ڕەنگ کرد. شەپقەی لەسەرناو چوو لە دەرگەی ماڵی پاشای داو بە پاشای گوت:

«پاشام خۆش بێ. هاتووم بەڵکو لەم کۆشکەی ئێوەدا کارێکم دەست کەوێ».

پاشا گوتی: «همم! بڵێم چی؟ با بزانم. ئا، یەکێکمان دەوێ بۆمان بچێتە بەر بەرازان.»

کوڕەپاشا، رازی بوو. بوو بە بەرازەوانی ماڵی پاشا.

لە خوارێ، لە تەنیشت گەوری بەرازان ژوورێکی خراپووچکەیان دایە. ڕۆژ تا ئێوارە ئیشی دەکرد. ئێوارێ، مەنجەڵێکی بەقوڵپی هەبوو، لەسەر ئاگری دادەنا. مەنجەڵەکە دەوراندەوری زەنگوڵۆکە بوو. کە دەکوڵا. زەنگوڵەکان دەزرگانەوە. ئاوازێکی زۆر خۆش و دێرینیان لێ هەڵدەستا.

**هەیهوو! ئۆگستینی ئازیز،**
**ئەوەی هەبوو. هەمووی چوو، چوو، چوو.**

عەنتیکە لەوەدا بوو ئەگەر دەستت بدابایە بەر

هەڵمی مەنجەڵەکە بۆنی هەموو چێشتەکانی ئەو شارەت دەکرد • دەتزانی کێ چی لێناوە ؟ و کێ چی ئامادە کردووە ؟

ئەو مەنجەڵە لەکوێ ، گوڵەکە لەکوێ ؟ !

ڕۆژێکیان کچی پاشا لەگەڵ کارەکەران بە پیاسە چوونە گەڕانێ • کە بەلای ژووری بەرازەواندا تێپەڕین کچە گوێی لە ئاوازەکە بوو • بەبێدەنگی دانیشت و گوێی لێ ڕاگرت • چونکە خۆیشی گۆرانی « هەیهوو ! ئۆگستینی ئازیز »ی دەزانی . بەڵام هەر نیوەی دەزانی .

کچە کە گوێی لەم ئاوازە بەرزە بوو ، لە دڵی خۆیدا گوتی : « ئەدی بۆچی من تەنیا یەك پارچەی ئەو گۆرانییە دەزانم ؟ دیارە ئەو بەرازەوانە هونەرمەندێکی بەهرەوەرە • »

لەکارەکەرێکی ڕاخوڕی : « کچێ ، بڕۆ لەو بەرازەوانە بپرۆ ژوورێ • داوای لێبکە داخۆ ئەو ئامێرە بەچەند دەفرۆشێت ؟ »

کارەکەرەکە غاریدا چوو ، بە کوڕەی گوت : « ئەو مەنجەڵە بەچەند دەدەی ؟ »

بەرازەوان گوتی : « بە دە ماچی کچی پاشا • »

کارەکەرەکە قیژاندی : « وەیش ، خوا نەکا ، پیس و چەپەڵ • »

بەرازەوان گوتی : « ئەوەیە · مـالی خۆمـەو بەکەمتری نادەم »

کە کارەکەرەکە گەڕایەوە ، کچەپاشا لێی پرسی:

« ها ؟ چ بوو ؟ چی گوت ؟ »

کارەکەرەکە گوتی : « ناماقوڵی‌یەکی خراپی کرد، نـاگوترێ ! »

کچی پاشا گوتی : « چی‌یە ؟ چی گوت ؟ قەیدی ناکا بیڵێ · »

ئەویش بەچپە قسەی بەرازەوانی پێ‌ڕاگەیاند .

کچی‌پاشا گوتی : « با بـڕوا ئـەو خوێـڕیو ناکەس‌بەچەیە · »

لێی‌دا ڕۆیشت . نەختێـك دوورکەوتـەوە · دیسان زەنگوڵەکان زرنگانەوە :

**هەیهوو ! ئۆگستینی ئـازیز ،**

**ئەوەی هەبوو · هەمووی چوو ، چوو ، چوو ·**

کچی‌پاشا بەکارەکەری تاینی گوت : « گوێـت لێبێ · بڕۆ لای بەرازەوان‌و پێی‌بڵێ مەنجەڵەکەی بە دەماچی کارەکەرەکەم نادات ؟ »

بەرازەوان وەڵامی ناردەوە : « نەخێر · دە ماچی کچی‌پاشا . ئەگەر نا مەنجەڵەکەم نادەم · »

که کچی پاشا ئەم قسەیەی بیستەوە ، گوتی : هەتیوێکی چەند ئیسبك گرانە ٠ قەیدی نی یە . بەلام کارەکەرینە ، ئێوە دەورم بگرن تا کەس نەمبینێ ٠»

کارەکەرەکان هەر چوار دەوریان گرت و کراسیان فش کردەوە ٠ بەرازەوان دە ماچی خۆی کردو کچی پاشا مەنجەڵەکەی وەرگرت و ڕۆیشت .

ئای کوڕینە چەندیان هەوەس پێهات ٠ وەخت بوو لە خۆشی یان پەڕوباڵ دەرکەن ٠ ئەو ئێوارەیە تا ماڵ نووستنان و ڕۆژی پاشیش تا ئێواری مەنجەڵەکە هەر کوڵا ٠

هەر لە بارەگای پاشاوە بگرە تا دەگاتە دوکانی پینەدۆز دەیانزانی هەر ئاگردانێکی شار چی تێدا لێدەندرێ ٠

کارەکەر کەوتنە چەپلەکوتان و هەلەکەسەما :

« دەزانین کێ شۆربای خۆش و کێکی هەیە ؟ دەزانین کێ مزەورەو گۆشتی هەیە ؟ چ لەوە خۆشتر دەبێت ؟ !

خاتوونی حەرەمسەرای شاهانە پێی گوتن : « ڕاستە ، خۆشە ، بەلام نرخەکەی گرانە ٠ کچێ بابان کوێرینە ئەمن کچەپاشام نەکەن ئەو بهێنییەم ببەنە دەرێ ٠ حەیام دەچێت ! »

هەموو پێکەوە گوتیان : « ئەیەڕۆ ،

قەت گەسسێ • خانم قسەی وا گوو دەگەی ؟ شتی وا چۆن دەبێت ؟ »

بەرازەوان – یا بلێین کوڕەپاشاکە ، چونکە ئەوان نەیاندەزانی کوڕەپاشایە ، هەر بە بەرازەوانی تێدەگەیشتن • – ڕۆژ نەبوو خۆی بە شتێکەوە خەریك نەکات و عاجباتی‌یەك نەنوێنێ •

ئەمجارەیان شەقشەقەیەکی دروست کرد • کە بات بدایە سەماو هەلپەڕکێیەکی وای دەکردو ئاوازێکی وای دەخوێند لەوەتی دونیا دونیایە شتی وا نەبووەو نابێت •

دیسان کچەپاشا بەوێدا تێپەڕی • هەلوەستەیەکی کرد • گوتی : « ئەمە خۆشە ، ئەدی. قەت بەزمو ئاوازی وا خۆشم نەبیستووە • » بەکارەکەرەکەی گوت : « کچێ ، بڕۆ ژوورێ • پێی بلێ داخۆ ئەو ئامێرە نرخی چەندە • بەلام پێشەکی پێی بلێ ئەمجارە هیچ ماچی نادەمێ ، ها ! »

کارەکەر لە بەرازەوانەکە چووە ژوورێو داخوازی کچی پاشای پێڕاگەیاندو هاتەوەو بە کچەی گوت : « خانم ، سەد ماچی کچی پاشای دەوێت ! • »

کچی‌پاشا گوتی : « دیارە لێی گۆڕاوە • »

لێیدا ڕۆیشت . نەختێ دوورکەوتەوە •

سەنگرایەوە . لە شوێن خۆی چەقی • گوتی :
«ئەمن کچەپاشام . پێویستە هونەرو هونەرمەندان
هان بدەم • کچێ برۆ پێیبلێ با وەکو دوێنێ دە
ماچ لەمن بکاتو ئەوەیدی لە کارەکەرێکم » .

کارەکەرەکان گوتیان : « وەیش ! ئێمە شتی
وا قبوول ناکەین » کچیپاشا گوتی : « چیتێدایە •
کە من ماچی بدەمێ ئێوە بۆ نایدەنێ ؟ ئەوەش بزانن
کرێتان دەدەمێ . بەلاش نییە • »

کارەکەرەکە چووە لای بەرازەوانو داواکەی
پێڕاگەیاند • بەرازەوان گوتی : « سەد ماچی
کچیپاشا . ئەگەرنا هەرکەسە لە ماڵی خۆی • »

کچیپاشا گوتی : « قەیدی نییە • بەڵام ئێوە
دەورم بگرن • »

کارەکەرەکان بە ئەڵقە وەستان دەوریان گرت •
ئەویش لەگەڵ بەرازەواندا کەوتە ماچومووچو
ڕامووسان •

بەرێکەوت ، پاشا لەو کاتەدا چووە سەربانو
چاوی بەو هەرایە کەوت ، گوتی « پەککو ! ئەو
حەشامەتە چییە لای گەوڕی بەرازان • « چاوی
هەڵگلۆفت • عەینەکی کردە چاو . « ها ، کارەکەرن
یاری دەکەن • با بچم بزانم مەسەلە چییە »

قۆندرەی سۆلانی کردبووە پێ • پاژنەی

هەڵکێشاو چوو .. بەتەنگاوی چوو !
کە گەیشتە حەوشێ ، لێیانچووە پێش • کەس ئاگای لێنەبوو • کارەکەرەکان خەریکی ژماردنی ماچەکان بوون • چونکە نەیاندەویست کابرا نە ماچێك زیاتر بکات‌و نە ماچێك کەمتر • پاشا هەستایەوە سەر پەنجەی پێ‌و تەماشای کرد • کە دیتی بەرازەوان‌و کچەکەی لە باوەشی یەکترن‌و یەکدی ماچ دەکەن ، گوتی : « وەی ، وەی ، نەواومانکرد • ئەوە چییە ؟ »

بەرازەوان لە ماچی هەشتاو شەشەمین‌دا بوو کە پاشا قینی جۆشاو لنگەپێلاوێکی سرەواندە سەری هەردووکیان‌و گوتی : « بڕۆن ، لەم وولاتە نەمێنن ! »

بەرازەوان‌و کچەکەی لە وولاتی خۆی شاربەدەر کرد •
کچە دانیشت‌و فرمێسکی داباراند• بەرازەوانیش ماسەرکۆنەی بکات • لەو کاتەدا دایکردە بارانێ •
کچە کەوتە خوێندنەوەی نەزیرۆکان : «وای لە خۆم مل بە کوێنێ سەر بە هەشێ ، چارەڕەشێ • چۆن مێردم بە کوڕە پاشایەك نەکرد ؟ »
بەرازەوان چووە پەنا درەختێك • بۆیاغی رەش‌و فاوەیی لە دەم‌وچاوی خۆی شووشت • بەرگی کۆن‌و

چلکنی فڕێداو دەستەبەرگێکی شاهانەی کردە بەرو چووە بەردەم کچە • ئەوەندە قۆزو جوان بوو کە کچە چاوی پێ کەوت ، خۆی بۆ چەمانـدەوە • کوڕە پێی گوت : « تازە سوودی نییە • تۆم لەبەرچاو کەوت • بـە کوڕەپاشایـەکی کۆکو بێتاوان رازی نەبووی • ریزی گوڵوبولبولت نەگرت ، چووی بـۆ لەیستۆکێکی هیچ ماچتدایە بەرازەوان • منوتـۆ بۆ یـەك نـابین • پێکەوە هـەڵناکەین . هیـوام شادومانیتە • بەخێر بمینێی • »

وای گوت و ڕۆیشت • گەڕایەوە وولاتی خـۆی و کچە تا بەردەرگای ماڵێ لە دوی چوو • کوڕە دەرگای لەسەر خۆی خشت کلیـلداو شمشـیرەی ڕەپێش کرد •

کچەش هەر هێندەی بـۆ مایەوە • لـە دەرەوە ڕاوەستاو هەڵی کردە گۆرانی :

**هەیهوو ! ئۆگستینی ئـازیز ،**

**ئەوەی هەبوو • هەمووی چوو ، چوو ، چوو •**

# کـــوورك

هەندێ جـار کە پـاش وەشـتو چەخمـاخە ، بەتەنیشت تەبارەی گەنمەکوورکدا دەڕۆی ، دەبینی سووتاوەو ڕەشدا گەڕاوە . دەڵێی ئاگری لەسـەر کراوەتەوە . دەشتەکی دەڵێن برووسك لێیداوە . بەڵام دەزانی برووسك بۆچی لێیداوە ؟

چۆلەکەیەك مەسەلەکەی بۆ من گێڕایەوەو منیش بۆ تۆی دەگێڕمـەوە . چولەکەکەش بەش بـەحاڵی خۆی لە پیرەدارچنارێکی بیست بوو کە لە قەراغ تەبارە گەنمەکە بوو . ئێستاش هەر لەوێیـە . چنارێـکی زۆر گـەورەو بەهەیبەتـە . گڕنی گڕنی بووە . ناوقەدی شەق بووە . کلۆر بـووە . گیاو لاولاوی تێدا ڕوواوە . پیر بووەو کووڕ بۆتەوە . چڵەکانی وەکو پرچی سەوزو درێـژ شۆڕبوونەتەوە سەر زەوی .

ئەو ناوە هەمووی تەبارەیـە . تەبـارەی دەرە ،

جۆ ، هەرزن ، گەنم ، هەرزن کە پێ دەگات و دەلەرێتەوە وەکو باڵەفڕەی چۆلەکە زەردەی سەرچڵی وایە ٠

ئەو تەبارانە زۆر بەشانازی‌یەوە ڕوویان کردبووە ئاسمان ٠ تا گەورەتر دەبوون لە بێفیزی‌یان زیاتر دەنووشتانەوە ٠ یەکێ لەو تەبارانە . تەبارەی گەنم بوو ٠ ئەو تەبارە گەنمە یەکسەر لە بنی دارچنارەکەوە هەستا بوو ٠ بەڵام ئەو گەنمە وەکو دانەوێلەکانی‌دی نەدەچەمایەوە ٠ زۆر خورت و سەرگەرم بوو . لووتی ئەوەندە بەرز بوو نەبێتەوە .

گەنمەکە رۆژێکیان رووی کردە دارچنارەکەو پێی گوت : « گوڵەکانم بەقەد هەموو دانەوێڵەکانی ئەم ناوە دەبێت ٠ لەوان جوانتریشم . گوڵەکانم وەکو کولووکەسێو وان ٠ هەر زێنەتە تەماشام بکەن . ئەرێ پیرەدارچنارەکە ، کەس دەناسی لەمن جوانتر بێت ؟ »

دارچنار سەری لەقاند ، وەك ئەوەی بڵێت : « ئەدی چۆن ، زۆری لەتۆ جوانتر هەن ٠ »

گەنم لەرکان شەقی برد ٠ گوتی : « بڕۆ ، هەی پیرەداری ووڕوگێژ ٠ ئەوەندە پیر بووی گیات لە وورگدا ڕواوە ٠ قسەی وا چۆن دەکەیت . کێ هەیە لەمن جوانتر بێت ؟ »

زریان ڕەشەبایەکی توند هەڵی کرد. کە گەیشتە لایان هەموو گوڵەکان پەلکیان داخستو سەری نەرمیان دانەواند. بەڵام گەنمی کەپووبڵند ھێت ڕاوەستا. سەری هەڵکێشا. هەموو پێیان گوت:
« پیاوی چابە وەکو ئێمە سەر دابنەوێنە. »

گەنم گوتی: « من و سەردانەواندنیان نەگوتووە. »

دانەوێڵەکان هاواریان کرد: « وەکو ئێمە سەردابنەوێنە. فریشتەی ڕەشەبا بەسەر سەرماندا دەڕوا. باڵی وای پێوەیە لە هەورەکانەوە تا سەر زەوی پان بۆتەوە، بتگاتێ لێت دەداو دەتسووتێنێ. ماوەی پاڕانەوەت نادات. »

گەنم گوتی: « قەت ناچەمێمەوە. »

پیرەدارچنار پێی گوت: « گوڵەکانت پێوەدەو لاسکەکانت بچەمێنەوە. هەوراز مەڕوانە. برووسکەو هەورەتریشقەیە. بنیادەمیش ناوێرن شتی وا بکەن. چونکە تەماشای چەخماخەت کرد مانای وایە لە خوا ڕادەمێنی. ئەویش یەك تروسکەی بەر هەر کەسێك بکەوێ کوێری دەکات. نەخوازەلا ئێمە کە زۆر لە بنیادەم کەمترین. ئەگەر بوێرین شتی وا بکەین خوا بزانێ چیمان بەسەردێت. »

گەنم گوتی: « ئێمە بۆ لە بنیادەم کەمترین؟ دەوا

سەیری ئاسمانم کرد · چی دەبێ با ببێ ! »

بەم جۆرە بەبایی بوون‌و لووت‌بەرزی‌یەوە سەری کێل کردەوەو چاوی بڕی‌یە ئاسمان ·

بروسکەیەکی وای هاویشت دونیا بوو بە یەك پارچە گڕوبڵێسە ·

ڕەشەبا هات‌و تێ‌پەڕی · دونیا کپ بووەوە . گوڵی دانەوێلەکان قیت بوونەوە · بەو بارانە لە زاخ درانەوە · کەوتنە هەڵمژینی هەوای پاك‌و بێ‌گەرد · کەچی گەنمەکە کەوتە بەر برووسکەو سووتا بوو بە ڕەژوو · بوو بە کوورك . بوو بە بژارێکی بێ‌سوود ·

پیرەدارچناریش چڵەشۆڕەکانی لەبەر ( با )دا ڕاژەند · دڵۆپە بارانی زل‌زل لە گەڵا سەوزەکانی کەوتنە خوارەوە . دەتگوت بنیادەمەو فرمێسك دەڕێژێ · چۆلەکە لێیان پرسی :

« درەختەکە ! بۆ دەگری ؟ دونیا خۆشە · تەماشاکە دونیا چەند جوان دەبریسکێتەوە · هەور چۆن دەڕوا . ئەو گوڵ‌و نەمامانە بۆن کە · ئەو گریانەت لە چی‌یە پیرەدارچنار ؟ »

دارچنار هەقایەتی ڕکەستووری‌و لاملی‌ی گەنمەکەی بۆ گێڕانەوە· تێ‌ی‌گەیاندن چۆن گەنمەکە بە سزای خۆی گەیشت‌و سووتاو بوو بە کوورك ·

دونيا ئاوايه .

منيش كه ئەم هەقايەتەم بۆ گێڕانەوە ، ئەوە لە چۆلەكەيەكم بيست · ئێوارەيەكيان داوام لێ‌كرد هەقايەتێكم بۆ بكات ، ئەويش ئەمەی بۆ كردم ·
( نازانم بەدڵتان بوو يان نا ؟ )

# کوڕە چەتوونەکە

هەبوو نەبـوو ، پیرەشاعیرێك هەبـوو • زۆر بەروحمو میهرەبان بوو •

ئێوارەیەکیان لە ماڵەوە دانیشتبوو • بوو بـە بەفرو باران‌و کرێوەیەکی زۆر تووش • باران وەك کۆتکی دەونخوون دەهاتە خوارێ • بەڵام شاعیرەکە بەدڵنیایی لەبەر ئاگردانی دانیشتبوو. کزکز سێوی دەبرژاند •

شاعیرەکە پیاوێکی ئەوەندە میهرەبان‌و دڵنەرم بوو • لە دڵی خۆیدا گوتـی : « ئێسـتا هـەر بەستەزمانێـکی لەدەرەوە بـێ دەبێتـە مریشـکی ئاوەڕووت کراو • جێگەی تەقەلێکی لەشی بە ووشکی نامێنێ • »

لەو کاتەدا یەکێك لە دەرگەی داو بەدەم‌گریانەوە هاواری کرد : « ماڵێ ، دەرگام لێبکەنەوە • لە بارانێ

هەڵاتووم . لەسەرمان قەسریم ٠ » بارانیش خوڕخوڕ دەهاتە خوارێ ٠ ( با ) گڤڤەی دەهاتو پەنجەرەکانی ڕادەژەنی .

پیرەشاعیرەکە چوو دەرگای کردەوە ٠ دیتی کوڕێکی بچکۆلە لەبەردەرگا وەستاوە ٠

کوڕە رووتوقووت بوو . ئاوی لە پرچە درێژو زێڕینەکەدا دەچۆڕایەوە ٠ لەسەرمان هەڵدەرزی . ئەگەر نەهاتایە ژووری قنیاتی لەبەر دەبڕا ٠

پیرەشاعیرەکە دەستی گرتو گوتی : « گچکەل ، وەرە ژووریّ ٠ خۆت گەرم بکەوە. شەرابو سێوی برژاو بخۆ تۆ کوڕێکی زۆر قشتو بچووکی ! »

ڕاستە ٠ کوڕە کوڕێکی زۆر قشتو نازدار بوو. چاوی وەکو ئەستێرەی گەش وا بوون ٠ پرچی زێڕینی کە ئاوی لێ‌دەچۆڕایەوە زۆر جوان گلوارەی بەستبوو ٠ دەتگوت بێچووە فرێشتەیە . بەلام لەسەرمان زەرد هەڵگەڕا بوو ٠ چرکوهۆڕ دەلەرزی. کەوانێکی بەدەستەوە بوو . بەلام کەوانەکە لەبەر بارانێ تەڕ ببوو ، ئیشی نەدەکرد ٠ تیرەکانی خاو ببوونەوە .

پیرەشاعیرەکە لەبەر ئاگردانی دانیشتو کوڕەبچکۆلانەکەی لە تەنیشتە خۆی دانا ٠ پرچی گوشیو ئاوی لێ‌چۆڕاندەوە ٠ دەستە بچووکەکانی

لەنێو لەپی خۆیدا گەرم کردەوە ،

کوڕە بووژایەوە . کولمـەکانی گەشانـەوە ، بازێکی لەخۆی هەڵداو بە دەوری شاعیرەکەدا کەوتە سەما .

شاعیرەکە لێی پرسی : « گچکەل ، ناوت چی یە ؟»

کوڕە وەڵامی دایەوە : «ناوم کیوبیدە ، نامناسی. ئەوەتە کەوانەکەم ، تیری پێداوێم ، تەماشاکە باران لێی کردەوە . هەڵی برینگاند ، مانگ چـەند جـوان دەدرەوشێتەوە . »

پیرەمێرد گوتی : « کەوانەکەت کەلکی نی یـە ، ڕزیوە . »

کوڕە کەوانەکەی بەرزکردەوە . تەماشایـەکی کرد . گوتی :

(نەڕزیوە ، ئای ووشك بۆتەوە! هیچی لێ نەهاتووە. ژێیەکەی توندە ، با تاقی بکەمەوە . )

کەوانەکەی ڕاگرت ، تیرێکی هاویشتە بەرێ . نیشانەی لەسەر دلی شـاعیرەکە گـرتو لێیداو گوتی : «خۆ دیتت کەوانەکەم نەڕزیوە .» لە تریقەی پێکەنینی داو دەرپەڕی .

ئەو کوڕە چەتوونو سپڵەو چراعە دڵی شاعیرەکەی پێکا • کە سکی پێسووتاو هێنایە ژووریێو شەرابی دەرخوارد داو باشترین سێوی پێشکەش کرد •

شاعیرەکە برینێکی گەورەی کەوتە دڵ . راکشاو هاواری کرد :

« ئاخ ، کیوبید ! منداڵێکی چەند سپڵەو بێئەمەکە . • باسی ئەو بێئەمەکییەی بۆ هەموو منداڵان دەکەم بۆ ئەوەی وریای خۆیان بنو یاری لەگەڵدا نەکەن . چونکە ئەگەر لەگەمان پێکی بکەن، بۆی هەڵبکەوێ ئازاریان دەدات • »

شاعیرەکە هەموو کوڕوکچە خۆشەویستەکانی خۆی لە کیوبید وریا کردەوە . بۆ ئەوەی خۆیلێلابدەنو نەکەونە بەر زەبرو تەڵەکەو فێڵەکانی •

بەڵام کیوبید زۆر کەڵۆو حیلەبازە ئەوایش نەفرە دەدات •

کاتێك کوڕ لە قوتابخانە دێنەوە • دەچێ چاکەتێکی ڕەش لەبەر دەکاتو کتێبێك لەبن هەنگڵ دەنێو قەرەبەقەرەیان دەڕوات • ئەوانیش نایناسن.

وا دەزانن ئەویش قوتابی‌یە . لەخۆی نزیك دەکەنەوە ، قۆلی لە قۆلی هەڵدەکێشن و دەڕۆن . کە خافڵان ، کوڕە ، خۆیان لێ‌دادەنووسێنێ ، تیرێکیان ئاراستەی سەر دل دەکات .

کچیش ئەو کاتەی کە لە خوێندن دێنەوە ، یا ئەو کاتەی کە لە کلیسە دان ، تووشی ئەم کوڕە دەبن .

ئەو کوڕە چەتوونە لە هەموو شوێنێك بەدوای خەڵکەوەیە ، لە تیاترۆدا دەچێتە ناو چڵچرای بن ساپیتەو خۆی لەوێ مەڵاس دەدات ، وەك ئاگر دادەگیرسێ . خەڵك وا دەزانن چرایە ، گوێی نادەنێ .

هەندێ جاریش دەچێتە باخچەی پاشاو تەماشای رمبازی و تەڕادانێ دەکات .

دوور نەچین هەر ئەو کوڕە بوو جارێکیان تیری لە دلی دایك و باوکی تۆ دا ، تۆ لێیان بپرسە . بزانە چ دەڵێن ؟

وای ئەو کیوبیدە منداڵێکی بەدو لاسارو بەچیرەیە ، لە دوو خەڵك نابێتەوە .

کوڕینە ، وریا بن . خۆتانی لێ بپارێزن ، لەبیرتان نەچێ تیری لەدلی داپیریشتان داوە ، بەڵام لەمێژە .

دەك ئەسکوردت شکێ ، کیوبید ، بـۆ خـۆت‌و ڕەوشتت ٠ منداڵینە ! من هەر هێندەم لەسەرە کـە ووریام کردنەوە . ئەوا زانیتان کیوبید منداڵێـکی بێ‌حاڵ‌و بەدکارو شەڕفرۆشە ٠ جا ئێوەش کەیـفی خۆتانـە . .



بەرگ دەستکردی ( دارا محمد علی ) یە ٠

ئەم کتێبە (٣٠٠٠) دانەی لێ‌چاپ‌کـراوە

لە کتێبخانە نیشتمانی بەغـدا ، ژمارە (١٧٧٩)ی سالـی (١٩٧٩)ی دراوەتێ ٠

